نووسینی عەمر خالید

# پەرستشەکانی بیرکردنەوە



وەرگێڕانی

حوسەین مەحموود

کتێبخانەی نارین
هەولێر

# پەرستشەکانی بیرکردنەوە

## پێرست

## بەشی یەکەم : بیر کردنەوە لە دروست کردنی گەردوون



## بەشی دووەم :بیرکردنەوە لە دروست کردنی مرۆڤ

## بەشی یەکەم:

## بیرکردنەوە لە دروست کردنی گەردوون

لەراستیدا ئەوەی ئەمڕۆ بەسود بێت بۆ دڵ ، ئاماژەیەکە لە دڵەوە که هەر بەتەنها بەدڵ مومارەسە دەکرێت وە هەندێ جاریش چاو بەشدار دەبێت لەگەڵیدا، ئەوەش بریتی یە لە پەرستش ، کەبەداخەوە ئەمڕۆ خەڵکی پشتیان تێ کردووە .. وەبەرەو نەمان دەچێت .. وێنای ئەمە بکە کاتێ دەڵێن پەرستشێك خوای گەورە فەرمانی داوە پێمان ئەنجامی بدەیت وە ئەو پەرستشە نەماوە ، تۆش وێنای حاڵی مرۆڤایەتی بکە بەرەو چ ئاقارێك ڕۆشتووە .. کە بڵێین ئەو پەرستشە لەناو چووە ! لەڕاستیشدا لەناوچووەونەماوە .. ئەمڕۆ ئێمە دەمانەوێ لەدەروونماندا زیندووی بکەینەوە. وە لە هەموو کەسێکدا کەلەمەڕ ئەم پەرستشە دەدوێین لەگەڵیدا .. پەرستشێك خەڵکی پشتیان تێ کردووە ، ژمارەیەکی زۆر کەم نەبێت کە مومارەسەی دەکەن ، کە مومارەسەشی دەکەن ، بەیناو بەینێکی زۆر دوور ئەوە دەکەن ، کەلە کاتێکدا پێویستە بە بەردوامی مومارەسە بکرێت .

ئەم پەرستشە پێغەمبەران ئەنجامیان داوەو پێغەمبەر -ص- یش پەیڕەوی کردووە تا بووە بە یەکێك لە سیفەتە پەیوەستدارەکان پێیەوە . بەم پەرستشە خوا دەناسرێت ، وە ئەم پەرستشە بەڵگەیە لەسەر پەوەردگار .

ئایا زانیتان ئەم پەرستشە چی یە یان هێشتا ماوتانە؟.. بریتیە لە پەرستشی بیر کردنەوە لە دروست کراوەکانی خوا...

بیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی خوا ، پەرستشێکە لە مەزنترین پەرستشەکان ، بەم پەرستشە خەڵکی ڕادەمێنن لەگەورەیی پەروەردگار..

ئایا لەژیانتدا لەبەردەم دیمەنێکدا وەستاویت ، هەوڵت داوە لە تێڕوانینتەوە بۆی و لە بیرکەدنەوەت لێ ی کە خوای پەروەرگار ببینیت... قەولت داوە بەهەموو هێزێکتەوە بڵێیت : لا الە لا اللە (پەرستراو نیە بێجگە لە (اللە) ) .. دڵ لەعەزرەت گەورەیی و ترس و خۆفی پەروەردگار هاوار بکات ...

ئایا لەژیانتدا ئەم پەرستشەت ئەنجام داوە؟ ئایا زۆر جار ئەنجامت داوە ؟ بەنەجامدانی ئەم پەرستشە گوناهەکان فەرامۆش دەکرێن ، وە بەم پەرستشە پەروەردگارمان خۆش دەوێت ، وە بەم پەرستشە مەبەستی خوا لەگەرووندا تێ دەگەین ، وەبەم پەرستشە دڵ ناسك دەبێت و دەگات بە پەروەردگاری .. پەرستشی بیرکردنەوە لە دروست کراوەکانی خوا.

## بۆچی بیر بکەینەوە ؟

چونکە ئەم پەرستشە دەروازەی گەیاندنی ئێمەیە بە پەروەردگار... ابن القیم –رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ناسینی خوای پەروەردگار دووجۆرە :

یەکەم : ناسینی و دان نان بە بوونیدا، وە لەمەشدا پیاوچاك و خراپەکارو گوێڕایەڵ و سەرپێچیکەر بەشدارن تیایدا ، هەموان دەڵێن : پەروەردگار بوونی هەیە ، وە ئەمە جۆری یەکەمە لە ناسین و ئێمە لەمەڕ ئەمە نادوێین .

دووەم : ناسینی شەرم و خۆشەویستی و شەوق و هاودەمی و پەیوەندی و حەز و ترس و گوێ ڕایەڵی و قبولْ کردن ، ئەمە دەروازە دەکاتەوە بۆ هەرکەسێ کە بیەوێ بەم شێوازە خوای پەروەردگار بناسێ و دەرگاکانی بۆ بکرێتەوە.

نەکەی لە کۆمەڵەی یەکەم بیت لە ناسینی خوادا ، بەداخەوە ئازیزانمان زۆربەی ژنان و پیاوان و لاوانمان بە شێوەی یەکەم خوا دەناسن ... لەوانەیە بوونی هەبێ بەلاّم کاتێك کە ناڕەحەتیەکی بەسەرا دێت لەخوا دەپاڕێتەوە ... بەلاّم بیجگە لەم ناسینە ڕووکەشە ... وە لەوانەیە لە ناسینی خوادا دایك و باوکی شارەزاتر بێت ... وە لەوانەیە چەندێك ئاشناو شارەزایە بەڕواڵەتی ئافرەتێك کە خواو پێغەمبەرەکەی پێی ڕازی نین ئەوەندە ئاشنا نەبێت بە پەروەردگار، پێت دەڵێ بە دوورو درێژی چۆن کەسایەتیەکە وە چۆن بیر دەکاتەوە وە چی بەختەوەری دەکات وچی توڕەی دەکات و چۆن ئەم دەتوانێ ئەو ڕازیی بکات ، بەلاّم ئەگەر لێ ی بپرسیت دەربارەی پەروەردگار نیشانەکانی سەرسوڕمان لەڕووخساریدا دەردەکەون .. بەڵێ ئەو پەروەردگارەمان کە دروستی کردووین، ئەمە ناسینێك نیە کە پەروەردگار پێی ڕازی بێت .

تۆ بۆ ئەوە دروست نەکراویت کە بەم شێوەیە خوا بناسیت ، دروستی کردوین تا هەست بکەین بە شەرم و نەرم و خۆشەویستی و ترس و تاسە و هاودەمی و پەیوەندی، هەموو ئەم واتایانە ناسینێکی ڕاستەقینەییە. خەڵکی لە ناسینی خوادا بەم شێوەیە جیاوازن کەکەس نایزانێت بێجگە لەخوا –عز وجل – وە ئەم جیاوازیەش لە ئەنجامی ئەم

پەرستشە دایە کە لیٚ ی دەدوێین .. بەئەندازەی بیرکردنەوەت لە دروستکراوەکانی خواو لەجوانی دروستکراوەکانی دەرگای دڵت بەو ئەندازەیە بۆ ناسینی خوا دەکرێتەوە .. چەندە نزیك ببیتەوەو بیر و هۆشت زیاتر کار پیٚ بکەیت – ئایا بە ژیری و عەقڵت ڕێزی تۆ نەدراوە بەسەر ئاژەڵدا ، بۆچی؟ چونکە ئەوە بەرز بوونەوەی تۆیە بۆ لای پەروەردگار ، چەندە ژیریت بەشدار کرد لە ناسینی پەروەردگاردا بەهەندی ئەوە خۆشت دەوێت و زیاتر دەروازەت لیٚ دەکاتەوە بەڕادەی هەڵگرتنی بیرو هۆشت لەئاست بەرز ڕاگرتنی پەروەردگاردا نزیك دەبیتەوە لە پەروەردگار زیاتر و زیاتر و زیاتر... وە لەبەرئەوە ئەم ناسینە نایەتەدی بەتەواویی تەنها بە پەرستشی بیرکردنەوەو بەگەورەزانین نەبێت ، پەرستشێك کە جەستە ڕۆڵی تیادا نابینێت ،هەمووی لەدڵتدایە....

## چۆن بگەینە ناسینی خوای پەروەردگار ؟...

بەدوو ڕێگادەگەینە ناسینی پەروەردگار :

یەکەم: کتێبی خوای خوێندراو کە قورئانی پیرۆزە .

دووەم: کتێبی خوای بینراو کە لاپەڕەکانی گەردوونە ..

بۆ ئەوەی کە ئەو کەسەی خوێندنەوەو نوسین نازانێت بەڵگەی نەبێت لەسەر خواو بڵێت : من تۆم نەناسی چونکە خوێندنەوەو نووسینم نەدەزانی.. تیٚ نەدەگەیشتم .. ئایا نەت دەبینی ئایا نەیاندەبینی .. ئایا گوێیـان لێ نـەبوو ، تەماشـای دەوروبـەرت بکـە وەتەماشـای جـوانی دروسـتکراوەکانی خـوا بکـە ، کتێبـی خـوای خوێنـدراو کتێبـی خـوای بینراو کە فرسەت بەکەس نادات تا بڵێت : نەم ئەتوانی : نەم ئەتوانی ...

## بەهای ئەم پەرستشە

پێغەمبەر -ص- چۆن بوو بە پێغەمبەر ؟؟ دواهـەمین قۆناغـەکانی محمد-ص- پێش پێغەمبەرایەتی بریتی بوو لە تێڕامان و بیرکردنەوە .. خـاتوو عائشە -رض - لـەو فەرمودەیـەدا کـە بـاس لـە سـەرەتای نیگـا دەکات دەڵـێ ((.. پاشـان حـەزی لـە چۆڵەوانی دەکـرد ، دەڕۆیـشت بـەرەو ئەشکەوتی -حیراء - بەشەو تیایـدا دەمایـەوە بـۆ خـوا پەرسـتی چـەندین شەو ئەمە پیشەی بوو... ))

((ثم حبب الیه الخلاء ، فکان یذهب الی غار حراء یتحنث فیها – ای یتعبد – اللیالی ذوات العدد...))(اخرجەالبخاری[1] ومسلم(١٦٠)عن عائشة.

ئایا شوێنی ئەشکەوتی حیراء دەزانیت ؟ ئەشکەوتی حیراء ئەشکەوتێکی سامناك بووە ئەی چۆن پێغەمبەر دەچوو بۆ ئەو شوێنە ، جیگایەك هیچ مرۆڤێك نەتبینێت ، تۆ و ئاسمان و گەردوون بەرفراوانن لەبەردەم چاوەکانتدا ، لاوانی بەهێزیش بە ئاسانی نەیان دەتوانی بگەنە ئەو ئەشکەوتە .. بەڵام چۆن پێغەمبەر –ص– گەشتە ئەو شوێنە ؟ وە چۆن خواپەرستی دەکرد تیایدا ؟ چۆن لەو شوێنەدا تەنیایی خۆشەویست بوو لە لای ؟ وە چەندین شەو تیایدا دەمایەوە – واتە چەندین ڕۆژیش هەر لەو شوێنەدا بوو, لەوێ چی دەکرد ؟! .. خواپەرستی دەکرد . چ خوا پەرستیەك ؟ ئەو کاتە نوێژو ڕۆژوو لەئارادا نەبوون ، پێغەمبەر –ص– پێش ئەوەی ببێتە پێغەمبەر چ پەرستشێکی دەزانی ... پەرستشی تێڕامان !... پەرستشی بیر کردنەوە لە دروستکراوەکانی خوا ... ڕۆژانێکی درێژ دەمایەوە و بیری دەکردەوە ! ئەمەش ئامادەباشی بوو بۆ پەیامبەرداریی کە پێغەمبەرایەتیە .. پێویستە زۆر بیر بکاتەوە تا ئامادەباش و بێت ئەو پەیامە پیرۆزە وەربگرێت .. وە زیاتریش لەوە ، ئەگەر وویستت نزیك بیتەوە لە پەروەرگار ئەوە پێویستت بە خۆ ئامادەکردنێکی دەروونی درێژ هەیە بە بیر کردنەوە لە دروستکراوەکانی خوا و بەتەماشاکردنی پانتایی

---

[1] اخرجه البخاری ن و مسلم ( ١٠٥ ) عن عائشة ر . ض

گەردوون ... لەبەر ئەوە هەندێ کەس دەڵێن : من چاوەڕێ ی هاوینم تا گەشت بکەم ، وەمنیش دەڵێم : ئەوەی لە خواترس بێت سەفەر بکات بەم نیازەوە کە ناتوانێت ئەنجامی بدات بەشێوەیەکی باش ، بانیازی سەفەرەکەی بریتی بێت لەوەی کە بڵێ : من سەفەر ئەکەم تا دروستکراوەکانت ببینم پەروەردگارم وە بەشێوەیە تۆ دەپەرستم ناتوانم بەو شێوە ئەنجامی بدەم کە لە ولاتەکەمدایە، ئەو کاتە هاوینەکەت دەبێتە پەرستشی خوای گەورە ، کەس ناتوانێ پێت بڵێ : حەرامە گەشت بکەیت !! بەلام چی دەکەیت لە هاوینە هەوارەکان ؟ ئەوە کاری حەرامە ، چۆن گەشتەکەت نزیک دەکەیتەوە لە پەروەردگار .. ئەوە پەرستشی بیر کردنەوە و تێرامانە ، کە بە هۆیەوە پێغەمبەر -ص- ئادە باش بوو تا ببێتە پێغەمبەر .. دەتەوێ نزیک بیتەوە لە پەروەردگار مومارەسەی پەرستشی پێغەمبەر -ص- بکە . پەروەردگار دەفەموێ (( و كذلك نرى ابراهيم ملكوت السماوات و الارض وليكون من الموقنين )) الانعام :٧٥) واتە: ((بەو شێوەیە دەسەلاتی تۆکمەمان لە ئاسمانەکان و زەویدا نیشانی ئیبراهیم دەدەین بۆ ئەوەی بەڵگە بەدەست بێت و لەڕیزی دڵنیاکاندا بێت .

چەندە زیاتر بیر بکەیتەوە دڵنیایت زیاتر دەبێت ، وە هەروەها ئەم پەرستشە پەرستشی ابراهیم علیەالسلام بوو شەوێك بیلالی حەبەشی -رض- هات و پێغەمبەر -ص- نوێژی دەکرد ، پرسیاری کرد لە خاتوو عائشە دەربارەی ئەو شەوە ، ئایا چ کردارێکی پێغەمبەر -ص- جێگای سەرسوڕمانە ؟ خاتوو عائشە فەرمووی : چ کارێکی هەیە جێگای

سەرسوڕمان نەبێت ، بەڵام ئەگەر پرسیارتان کرد دەربارەی سەیرترین شەو دەدوێم بۆتان . هەستا شەو نوێژی کرد و گریا تا فرمێسکەکانی ریشی موبارەکی تەڕکرد ، پاشان ڕکوعی برد و گریا ، پاشان سوجدەی برد و گریا تا بیلال هات بۆ لای تا پێی بڵێ کە بانگی بەیانی بدات ، بیلال تەماشای کرد پێغەمبەر -ص- دەگری وتی بۆچی دەگریت چی دەتهێنێتە گریان ئەی پێغەمبەری خوا ، خوای پەروەردگار لە گوناهی ڕابووردوت و ئایندەت خۆش بووە ؟ ؟ پێغەمبەر-ص- یش فەرمووی (( افلا اکون عبدا شکورا وکیف لا ابکی وقد انزل علي الليلة هذه الاية (( ان فی خلق السماوات والارض واختلاف اللیل والنهار لايات لاولی الالباب (١٩٠) الذین یذکرون الله قیاما و قعودا وعلی جنوبهم ویتفکرون فی خلق السماوات والارض ربنا ما خلقت هذا باطلا سبحانك فقنا عذاب النار )) فبکی النبی -ص- لهذه الايات ثم قال ((ویل لمن قراها ولم یتفکر فيها ))[1]

واتە : پێغەمبەر -ص- فەرموی: ئایا نابێ بەندەیەکی سوپاس گوزار بم وە چۆن ناگریم ، بەخوا ئەم شەو ئەم ئایەتانەم بۆ دابەزی )) تەفسیری ئایەتەکان (( بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا لە ئاڵ وگۆڕی شەو ڕۆژدا نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند (١٩٠) ئەوانەی یادی خوا دەکەن لە کاتێکدا کە بە پێوەن یان دانیشتون یان ڕاکشاون وە هەمیشە بیر دەکەنەوە لە دروست بوونی ئاسمانەکان و

---

[1] سورەتی ال عمران ١٩٠- ١٩١) فەرمودەکەش ( ابن حبان ) گێراویەتیەوە لە ( صحیح) ەکەیدا ( ٦٢٠

زەوی و(دەڵێن) : پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروستکراوانەت بیٚ هوودە وو بیٚ ئامانج دروست نەکردووە ، پاکی و بێگەردی شایستەی تۆیـە ، دە تۆش بمان پارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ ))

پێغەمبەر -ص- دەفەمویٚ (( تفکروا فی خلق الله )) [1] ئەگەر ئێوە دەتانەویٚ خوا بناسن دەی بیر لە دروست کراوەکانی بکەنەوە ... عەقڵ نایبڕێت تەمەنت بیست یان سی ساڵ بێت و لە ژیانت دا دانەنیشتبیت ومونا جاتی پەروەردگار بکەیت بیر لە مەزنی دروست کراوەکانی دەسەلآتی پەروەردگار بکەیتەوە ... ئایا ئەمە عەقڵ ئەیبڕێت .. وە ئایا مرۆڤ دروست کراوەو بە عەقڵ ڕێزی لیٚ نراوە بۆ خواردن و خواردنەوەو بیر کردنەوە تەنها لە شەهوەتەکانیدا ؟ بۆچی پەرەوەردگار عەقڵی بۆ مرۆڤ دروست کردوە ؟ بۆ ئەوەی چۆن بەکاری بهێنێت ؟ ئەم بەها یەکەمە لە پێناویدا دروست کراوە چی یە بۆ ئەوەیە پەروەردگار بناسێت : عەقڵ هیچ سەنگێکی نیە ئەگەر گرنگی نەدات بە و شتەی کە لە پێناویدا دروست کراوە ، بەلآم ئەوەی لە واقیعدا دەیبینین عەقڵ گرنگی بە شتێك دەدات کە بۆی دابین کراوە ، گرنگی بەرۆزی دەدات لە کاتێکدا بۆی دابین کراوە ، گرنگی بە شەهوەت دەدات کە ڕێگای لیٚ گیراوە وە بیری چووە کە لە پێناوی چی دا دروست کراوە کە ئەویش ناسینی خواو پەیوە ندیە بە خوای پەورەردگارەوە .. پێغەمبەر -ص- دەفەرمویٚ ((تفکروا فی خلق الله و لا تفکروا فی الله فانکم لن تقدروا

[1] اخرجە ابن حبان ( ٣-٨٥) فی الحجر وحین -و ابو نعیم فی الحلیة (٦/ ٦٧) - والدلیمی فی الفردوس ( ٨/ ٢٣)

قـدره ))[١] واتـه : بـیر لـه دروسـتکراوەکانی خـوا بکەنـەوە وە بـیر لـه خوامەکەنـەوە ، چـونکه توانـاتـان ناشـکێ بەسـەریدا )) پرسـیار لـه ( ام الدرداء) کرا : ((باشترین کاری ابو دەرداء )) چی بوو ؟ خێزانیشی وتـی : بیر کردنـەوە و بایەخـدان بـوو : (( تفکیر والاعتبار )) وه ئایا باشترین پەرستش بەلای (ئەبو دەرداء ) ەوە بیر کردنەوە بوو له دروستکراوەکانی پـەروەردگار ... تەماشـاکه ئـەم عیبـادەت و پەرستـشه چـەند فـەرامۆش کـراوەو لـه بیر کـراوه . عـامری کـوڕی عەبد قـیس وتـی : گـوێم لێ بـوو نەلەیەك و نه لەدوو نه له سێ یان زیاتر له هـاوەڵانی پێغەمبـەری خوا – ص– دەیان ووت : ((ان نور الایمان التفکیر))[٢] واتـه : نـوری ئیمـان لـه بیر کردنەوەدایـه ئەگـەر ویـستت ئیمـان دڵـت ڕونـاك بکاتـەوە بیر لـه دروسـت کراوەکـانی خـوا بکـەرەوە (( چـونکه بەڕاسـتی نـوری ئیمـان لـه بـیر کردنەوەدایه .. تەماشاکەن ئەم پەرستشه چەندە بەرەو نەمان ڕۆشتوه .. پەرستشێکی مەزنه ، کەس لەم گەردونەدا ئـەنجامی نـادات تـەنها کۆمەڵـه کەسانێکی کەم نەبن .

حەسەن دەڵێت (( تفکر الساعة خیر من قیام اللیلة))[٣] واتـه: یـەك سەعات بیر کردنـەوە خـەیری لـه شـەو نویـژ زیـاتره ... بیر کـەرەوە کـاتێ حەسەن ئەم ڕستەیه دەڵێت مەبەستی تیایدا ( بیر کردنەوەی سەعاتێك) ه ... دانیشیت له ژورەکەتدا لەنێوان خۆت و دەرونتدا تەماشای دروست

---

[1] اخرجه الدیلمی فی الفردوس ( ٨ / ٢٢) عن ابن عباس ( ر . ض) ، تەماشای ( کشف الخلفاء) بکه ( ١/ ٣٧١) .

[2] تەماشای تەفسیری ( ابن کثیر ) بکه ( ١ / ٤٣٩)

[3] اخرجه ابن ابی شیبة فی المصنف ( ٣٥٢٢٣) و ابن ابی عاصم فی الزهد ( ص / ٢٧٢)

کراوەکانی خوا بکەیت لە دەروونت دا یان لەبەردەم دەریایەکدا دابنیشیت یان هەستیت بە نوێژی بەیانی و چاودێری هەڵهاتنی خۆر بکەیت و تێی ڕابمێنیت چۆن پەروەردگار شەو دادێنێت بەسەر ڕۆژدا و ڕۆژ دادێنێت بەسەر شەودا ، بیر کردنەوەی سەعاتێك خێری زیاترە لە شەونوێژێك ..

عومەری کوڕی عبد العزیز دەڵێ (( تێڕامان لە نیعمەت و ڕۆزیەکانی پەروەردگار باشترین پەرستشە[1]. کەواتە لە باشترینی پەرستشەکان ئەوەیە کە تێ ڕابمێنیت لە نیعمەتەکانی خوا ,

لەبەر ئەوە دەبینیت کە لە قورئاندا هەمیشە بانگت دەکات بۆ کارکردن بە عەقڵ و هۆش ، پەروەردگار دەفەرموێ (( افلا ينظرون الى الابل كيف خلقت (٥) و الى السماء كيف رفعت (١٨) و الى الجبال كيف نصبت ( ١٩) و الى الارض كيف سطحت ( (٢٠) )) الغاشية( ١٧ –٢٠) واتە : ئایا بێ باوەڕەکان سەرنجی ووشتر نادەن چۆن دروستکراوە ، ئایا سەرنجی ئاسمان نادەن چۆن بەرزکراوەتەوە، ئەی سەرجدی کێوەکان نادەن چۆن داکوتراون و دامەزرێنراون ، ئەی سەرنجی دەشتەکانی زەوی نادەن چۆن تەختکراوە))

باسی کردوون و وازی لێ هێناون تا بیر لە لە دروستکراوە مەزنانە بکەنەوە ..

پەروەردگار دەفەرموێ: إِنَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِلْمُؤْمِنِينَ(٣)وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِنْ دَابَّةٍ آيَاتٌ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ(٤)وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ

---

[1] اخرجه ابو نعيم فى الحليه ( ٥/ ٣١٤)

وَالنَّهَارِ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنْ السَّمَاءِ مِنْ رِزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ آيَاتٌ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ(٥) الجاثية(٣-٥) واتە (( بەڕاستی لە ئاسمانەکان و زەویدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێ کە بڕوادارن (٣) هەروەها لە دروستکردنی ئێوەدا لەو هەموو زیندەوەرە جۆراو جۆرانەی کە لەسەر زەوی بلاویان دەکاتەوە بەڵگەو نیشانەن بۆ کەسانێ یبر هۆشیان دەخەنەکار (٤) وە هەروەها لە جیاوازیی شەوو ڕۆژدا ، لەو ڕزق و ڕۆزیەی کە لە ئاسمانەوە خوا باراندوویەتی ، بەو هۆیەوە زەوی زیندوو کردەوە دوای ووشك بوون و مردنی ، هەروەها لە گەڕان و جوڵەی هەوادا ، لە هەموو ئەوانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێ هۆشیان دەخەنەکار ))

هەموو ئەمانە هەستت ناهەژێنن .. هەموو ئەم ئایەتانە بەهۆی ڕاهاتنت لە گەڵیدا هیچیان کاریگەریان نیە لەسەر دڵت ؟ براو خوشکان ئاگادار بن خراپترین شتێك کە تووشی نەوەی ئادەم بێت ئەوەیە کە هۆگر بیت بە نیعمەتەکانی خواوە ، لە خراپترین شتەکان هۆگر بوونە بە نیعمەتەکانەوە ، پەروەردگار لەسەر ئەوە سەرزەنشتی قوڕەیشی کرد چونکە هۆگری و خو پێوە گرتن عەیبێکی زۆر خراپە ، پەروەردگار دەفەرموێ ((لِإِيلافِ قُرَيْشٍ(١)إِيلافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ(٢) (٢) قريش ) ١١-٢ واتە : لەبەرئەوەی قوڕەیش هۆگر بووە و خوی گرتوە بە کاروانی زستانەی ( یەمەن ) وە کاروانی هاوینەی ( شام ) بۆ بازرگانی و دابین کردنی بژێوی خوویان گرتبوو بە کاروانی بازرگانی و زستان و هاوینەوە .. بانگەوازیان بۆ هات کە هەستنەوەو بە ئاگا بێن لە خو گرتن بە نیعمەتەوەو سەر لەنوێ ڕوانینیان نوێ بکەنەوە .. لە کۆتایی

سورەتەکەدا پێیان دەڵی : ((فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَـذَا الْبَيْـتِ(٣)الَّـذِي أَطْعَمَهُـمْ مِـنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَـوْفٍ(٤))) قريش ٣-٤ واتـه : کەواتـه با پـەروەردگار و خاوەنی ئەم ماڵە پیرۆزە بپەرستن ، ئەو زاتەی لە برسیەتی ڕزگاری کردن لە ترس و بیمی (جەردەکان) پاراستونی ئاسایشی بۆ دابین کردوون ) )
بزانن کـه هـەموو شـتێك لـه بووندا لـه دروسـت کراوەکـانی پـەروەردگارە پێویـسته تەماشـای بکـەن و پەنـدی لێ وەر بگـرن دەی بیر بکەنـەوە و بـا ووردە ووردە دەسـت پـێ بکـەین ... سـەرەتا لـە گەردوونـەوە دەسـت پـێ دەکـەین ، پاشـان دەچـینە سـەر ئاسمانـەکان ، پاشـان دادەبەزینـە سـەر زەوی پاشـان تەماشـای باڵنـدە و گیانلەبـەران دەکـەین پاشـان لەمـەڕ دەروونمان دەدوێین ، هەر گەردیلەیەکی هەزاران بەڵکو ملیۆنەها ئایەت و بەڵگەو نیشانەن ..

با دەست پێ بکەین و بپرسین چۆن سـەرەتای گـەردوون دەسـتی پێ کرد ؟

بابیر لەم مانایە بکەینەوە، با پێکەوە بیر بکەینەوەو بەبەردەوامی مومارەسـەی ئـەم عیبادەتـە بکـەین ، ئـەو کاتـەش ژوانەکـەمان دەبێتـە ژوانێکی کردەیی و ئەم پەرستشەی تێدا مومارەسـه دەکـەین .. یەکـەمین پەرستش کە دەست پێ بکەین لە بیر کردنەوە دا ئەوەیە کە بیر بکەینـەوە چـۆن دروسـت کـردن دەسـتی پـێ کـرد ,,, ئـەم ئایـەت و فەرمودانـە بخوێنەرەوەو بیر بکەرەوە لە مەزنی پەروەردگار .

پـەروەردگار دەفـەرموێ (قُـلْ سِـيرُوا فِـي الأَرْضِ فَـانظُرُوا كَيْـفَ بَـدَأَ الْخَلْـقَ) العنكبـوت /٢٠ ) واتـه : (ئـەی پێغەمبـەر ) پێیـان بڵـێ بـا بگـەڕێن

بەسەر زەویدا ، تەماشە بکەن چۆن ئەو زاتە دروست کراوەکانی بە دیهێناوە ))

بیر بکەرەوە چۆن دەستی پێ کردو بەدیهێنەر کێ بوو ... ئەی ئەوانەی وا گومان دەبەن کە ئێوە شارستانی سازن ، ئەی ئەوانەی وا گومان دەبەن کە ئێوە ڕێبەرایەتی مرۆڤایەتی دەکەن ، کێ دروستکەرە ؟ پەروەردگار دەفەموێ ((اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ(٦٢))) الزمر /٦٢) واتە : خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە ، هەر ئەویش سەرپەرشتیار و پاریزەری هەموو شتێکە )) ئایا ئەم ئایەتانە وات لێ ناکەن کە بیر بکەیتەوە ؟ .... عەمرانی کوڕی حصین –رض– وتی : وەفدێکی یەمەن هاتە لای پێغەمبەری خوا –ص– وتیان ئەی پێغەمبەری خوا هاتووین بۆ لات تا لە ئاین تێ بگەین و لێت بپرسین سەرەتای ئەم کارە چۆن بوو ؟ مەبەستیان چی بوو ؟ چۆن بوو سەرەتای بوونەوەر ؟ وەك ئەوەی بڵێن ئەی پێغەمبەری خوا سەرەتایی بوونەوەر چۆن بوو ؟ ئەم فەرمودەیە بوخاری گێراویەتیەوە – پێغەمبەر–ص– فەمووی :( كان الله وحده )) واتە : خوا بە تاك و تەنها بوو )) لا الە الا الله ، تەماشای لاوازی خۆت و توندی پەیوەست بوونت بەخواوە بکە . ئێستە شەش ملیار کەس لە سەر زەویدایە ٣/٤ یان بیر لە خوا دەکەنەوە ؟ وە ١/٤ ی تریش کە ماوەتەوە موسڵمانن ، تەنها خوا دەزانێ حاڵی ئیسلامەتیەکەیان چۆنە ، دوای هەموو ئەمانە وا گومان دەبەن کە ئێمە شارستانیمان سازاندووە ؟؟... ئێمە کێین ؟ .. ئێمە زۆر هەژارین . سەرەتای ئەم بوونەوەرە چۆن بوو ؟ پێغەمبەر –ص– دەفەرموێ : خوا

تاك و تەنها بوو ، پێش ئەو هیچ شتێکی تر نەبوو )) (( کان الله وحده ، ولم یکن شیء قبله)) [1] لە ریواتێکی ترا هاتوە (( کان الله ولم یکن شیء غیره )) [2] (• الله خالق کل شیء )) خوا دروست کەری هەموو شتێکە هەموو شتێك .

فەرمودەی پێغەمبەر -ص- ((ان اول ما خلق الله القلم فقال له اکتب فجری فی تلك الساعة بما هو کائن الی یوم القیامة )) [3] واتە : یەکەمین شتێك کە خوا دروستی کردووە پێنووس بوو ، پێی فەرموو : بنوسە

.. تەماشای مەزنی پەروەردگارو توانای پەروەردگار بکە : ئایا بیر لە لاوازی خۆت ناکەیتەوە وەداوای کۆمەك لە پەروەدگاری مەزن ناکەیت ...

لە ئەبوو هورەیرەوە -رض- وتی : پێغەمبەری خوا -ص- دەستی گرتم و پاشان پێغەمبەر -ص- باسی سەرەتای دروست بوونی بۆ ئەبو هورەیرە دەکرد _ وە پێی فەرموو (خلق الله الاتربة فی یوم السبت ، وخلق فیها الجبال فی یوم الاحد ، وخلق الشجر فیها یوم الاثنین ، وخلق المکروه یوم الثلثاء ، وخلق النور یوم الاربعء ، وبث فیها الدواب یوم الخمیس ، وخلق ادم علیة السلام بعد عصر یوم الجمعة )) [4] واتە : خوای گەورە لە ڕۆژی شەممەدا خاکی دروست کرد ، ،

---

[1] اخرجه البخاری ( ٧٤١٨)

[2] اخرجه البخاری ( ٣١٩٢ ) عن عمران بن حصین -ر . ض-

[3] اخرجه ابو داود ( ٤٧٠٠) والترمذی ( ٢١٥٥ ) و احمد ( ٢٢١٩٧) عن عبادة بن الصامت ( ر. ض )

[4] اخرجه مسلم ( ٢٧٨٩) ، واحمد ( ٨١٤١)

وە لــە ڕۆژی یــەك شــەممەدا شــاخەكانی دروســت كــرد ، وە لــە ڕوژی دووشەممەدا درەختی دروست كرد ، وە لە ڕۆژی سێ شەممەدا خراپەی دروست كرد ، وە لە ڕۆژی چوار شەممەدا ڕووناكی دروست كرد ، وە لە ڕۆژی پێنج شەممەدا چوار پەلی بۆ كرد ، وە دوای عەسری ڕۆژی هەینی ئادەم – علیه السلام – ی دروست كرد )) وە لەبەر ئەوە لە ڕۆژی هەینی دا سەعاتێك هەیە كە دوعای تێدا ڕەت نابێتەوە و وەلاّم دەدرێتەوە . ئەمە بۆ ئەوەی بزانین سەرەتای دروست بوون چۆن بووە ، ئێستەش بیر دەكەیتەوە لەگەڵمدا كە تۆ كێیت ؟ كێ بەهێزە لە زەویدا . كێ مەلەكوتی هەموو شتێكی بەدەستە كێ یە پەنای پێ دەبرێ و پەنا بۆ كەس نابات كێ دەسەلاّتی هەیە بەسەر هەموو بەندەكانیدا .. ئایا بینیت سەرەتای دروست كردن چۆن بوو ؟ تۆ بەمە ناوی یەكەمی خوات ناسی ، با بیر لە كۆتایی بكەینەوە .. ئەم دروستكراوانە بەشی كۆتاییان دێت ؟ عبد الله یكوڕی موبارەك دەڵی : چوومە لای پیاوێكی تر – ئەویش هەر لە شوێنكەوتوان بوو – پێم ووت – لە كاتێكدا كە تێڕامابوو بیری دەكردەوە : گەیشتیتە كوێ ئەویش ووتی : گەیشتمە ڕاستە ڕێگا )) باپێكەوە بیر لە كۆتاییی ئەم گەردوونە بكەینەوە ، وە تەماشای قەبارەی ئارەزووەكانت و شەهوەتەكانت و سەرپێچیەكانت و دنیاكەت هەمووی بكە .. پەروەردگار دەفەرموێ ((و نفخ فی الصور فصعق من فی السماوات ومن فی الارض الا من شاء الله ( الزمر /٦٨ ) واتە : لەو ڕۆژەدا فوو دەكرێت بە – صور– دا ، هەركەس لە ئاسمانەكان و زەویدا مابێت خێرا دەمرێت ، مەگەر كەسێك خوا وویستی لەسەر مردنی نەبێت . یەك فوو كۆتایی بە

مرۆڤ و شاخەکان و ئاسمانەکان و زەوی و باڵندەکان دێنێت ! مرۆڤ و تەکنەلۆژیاو هەموو شتێك کە پێ ی گەشتووین بەیەك فوو نامێنن ... هەموو شتێ بەیەك فوو کۆتاییان دێت . ئەی مرۆڤ چەندە لاوازیت .. بەیەك فوو هەموو شتێك نامێنێت (( و نفخ فی الصور فصعق من فی السماوات ومن فی الارض الا من شاء الله)) ، کە ئەوانیش بریتین لە جوبرەئیل و میکائیل و ئیسرافیل – کە فوو ئەکات بە صور (کەڕەنا) دا – و فریشتەی مردنە . وە خوای پەروەردگار بانگ دەکات : ئەی فریشتەی مردن کێ ماوە؟ ئایا دەبینیت چۆن هەموو شتێك دەستی پێکرد و چۆنیش کۆتاییان دێت .. دووبارە خوای پەروەردگار بە تەنها دەگەڕێتەوە و دەفەرموێ : ئەی فریشتەی مردن کێ ماوە؟ -لا الە الا الله .. لە بەندەکات جەبرەئیل و میکائیل و ئیسرافیل و فریشتەی مرد ماون .. ئەی فریشتەی مرد گیانی جوبرەئیلیش بکێشە ، ئەویش گیانی جوبرەئیل ئەکێشێ (( کل من علیها فان )) (الرحمن /٢٦ واتە : هەموو ئەوانەی لەسەرزەوین فەوتاوو تیاچوون... کێ ماوە ئەی فریشتەی مردن ؟ ئیسرافیل و میکائیل و بەندەت فریشتەی مردن ، ئەی فریشتەی مرد گیانی ئیسرافیلیش بکێشە ، ئەویش گیانی ئسرافیل دەکێشێ ، کێ ماوە ؟ میکائیل و بەندەت فرشتەی مردن ، گیانی میکائیلیش بکێشە ، کێ ماوە ؟ ئەی پەروەردگار بەندەت فریشتەی مردن ، ئەی فرشتی مردن گیانی خۆت بکێشە ، فریشتەی مردنیش گیانی خۆی دەکێشتێ ، کێ ماوە ؟ خوای تاك و تەنها . وە پەروەردگار بانگ دەکات ئەمڕۆ دەسەڵات و موڵك هێ کێیە ، ئەمڕۆ دەسەڵات و موڵك هی کێ یە ، ئەمڕۆ دەسەڵات

و موڵك هی کێیە ؟ لە فەرموودەکەدا هاتووە ئینجا پەروەردگار ماوەی چل بانگ دەکا ئەمڕۆ دەسەڵات و موڵك هی کێیە ؟ چل چی : ڕۆژ یان ساڵ یان مانگ یان ملیۆن ساڵ؟ ئیتر کات بەهای نامێنێت ، ئەوە خوای تاك و تەنها شوێن و کات لەگەڵ خوای گەورەدا نیە )) ئەمڕۆ دەسەڵات و موڵك هی کێ یە کەس وەڵام ناداتەوە )) چونکە کەس بوونی نیە ، ئینجا خوا گەورە و پەروەردگار دەفەموێ (( دەسەڵات و موڵك ئەمڕۆ تەنها بۆ خوای باڵادەستە ))[1]

پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگار .. ئایا ناوی یەکەم و دواهەمینتان بینی ؟ ئایا بینیتان چۆن گەردوون دەستی پێکرد و چۆنیش گەردوون کۆتایی پێ هات ؟ خوشك و برایانم ئەم خاڵە پێویستی بە بیر کردنەوەی زۆر هەیە . بەخوا ئازیزانم ئەگەر بیر کردنەوە لە مەزنی پەروەردگار بەو دەسەلأتەی کە هەیەتی و بە پێی پێویست هەر گیز سەرپێچی خوا ناکەین ...

بابیر لە شتێکی کە بکەینەوە ، با تەماشای ئاسمانەکان بکەین ، باتەماشای ئاسمانەکان بکەین لە سەرەوەوە لە زانایان بپرسین کە دەرکیان کرد بەوەی (( انما یخشی الله من عباده العلماء)) فاطر (٢٨) واتە : بێ گومان ئەوانەی لە خوا دەترسن لەبەندەکانی زاناکانن .

با لە خۆرەوە دەست پێ بکەین ... خۆر سەرچاوەی ووزەمانە ، ئەگەر خۆر نەبێت ژیان لەسەر زەویدا نابێت ، چۆن ڕوناکیەکەی و

---

[1] اخرجه ابن راهیة فی مسنده (١ / ٨٧) والالکانی فی اصول اعتقاد اهل السنة ( ٢/ ٢٢٢) والبیهقی فی الشعب ( ١ / ٣١١) ن و تەماشای تەفسیری ابن کثیر بکە ( ٢ / ١٤٧ -١٤٨)

گەرمیەکەی دەگاتە لامان گوی ٔ لەم زانیاریانە بگرە دەربارەی خۆر تا پـــەروەردگارت و توانـــای پـــەروەردگارت و دەســـەلات و مـــولکی پەروەردگارت بناسیت .

زانایان دەلێن : خۆر لە کارلێکێکی ناوکی بەردەوامدایە لە نێوان شەش سەد و پەنجا ملیۆن تەن هایدرۆجین و لەگەڵ شەش سەدو پەنجا ملیۆن تەن لە هیلیۆم ، لەئەنجامی ئەم کارلێکەدا گەرمایەك دروست دەبێت کە دەگاتە بیست و حەوت ملیۆن پلە لەوە چوار سەد ترلیۆن، واتە لە چرکەیەکدا ، ئایا دەتوانی وێنای قەبارەی ئەو ووزە بەرهەم هاتوەی خۆر بکەیت ، قەبارەکەی ملیۆنێك و دووسەد جار لە زەوی گەورەترە ، وە نەوەدو سێ ملیۆن میل لە زەویەوە دوورە — وێنای مەزنی دروستکراوەکانی خوا بکە — لەگەڵ ئەوەدا ڕوناکیەکەی لە ماوەی هەشت خولەکدا دەگاتە لامان .

پەروەردگار دەفەموێ (( والشمس والقمر حسبانا)) (الانعام: ٩٦)

واتە : ڕۆژو مانگیشی کردووە بە هۆی ڕاگرتنی حیساب.

زانایان دەلێن : خۆر بە خێرایەکی سەیر دەبزوێ کە لەیەك چرکەدا ئەوندە ماوە دەبڕێت کە مرۆۋ بە پێنج سە سالٚ ڕۆشتن دەبڕێت ، ئایا وێنای ئەو خێراییە لە ڕادەبەدەرە دەکەیت !.. گوێ لە وتەی پەروەردگار بگرە ( والشمس تجری لمستقرٍ لها)) (یس :٣٨) واتە : خۆریش لە گەردش و سورانەوەی خۆیدا بەردەوامەو بەرەو سرەوت دەچێت ))

وورد بەرەوە لە ووشەی تجری ، ووشەی (تتحرك) بەکار نەهاوە

.. وە تەماشای دەسەلاتی پەروەردگار بکە لەو خۆرەدا

با ڕابمێنین لە کۆمەڵەی خۆر یان بەشێك لە کۆمەڵەی خۆر .. کۆمەڵەی خۆر پێك هاتووە لە نۆ هەسارە هەموومان دەیانزانین : زوهرە ، عەطار ، موشتەری ، زوحەل و نیبتۆن و بلۆتۆ .. نۆ هەسارە کە زەویشی تێدایە کە لەسەری دەژین ، لە کۆمەڵەیەکدایە کە پێ ی دەوترێ : کۆمەڵەی خۆر .. هەموویان بەدەوری خۆردا دەسوڕێنەوە .

ئەم ( کۆمەڵەی خۆر)ەی کە ئێمەشی تێداین کە خۆر تێیدا نەوەدو سێ ملیۆن میل لێمانەوە دوورە هەمووی بە شێکی بچووکە لە کاکێشانێك کە پێك هاتوە لە دوو سەد بلیۆن ئەستێرە ، کە خۆر تاکە ئەستێرەیە کە تیایدا ، ئایا دەتوانی وێنای ئەو پانایيە فراوانە بکەیت ، وە ئەو کاکێشانەی لەسەری دەژین ناوی ڕێگای کاکێشانە , وە یەکێکە لە سەد هەزار کاکێشان ، کە زانایان تا ئێستا دۆزیویانەتەوە .. دەمەوێ تەماشای موڵکی خوا بکەیت .. ئیتر تۆ چیت ئەی دروستکراوی لاواز تا سەرپێچی پەروەردگار بکەیت ؟! تۆ کێیت ؟ .. تەماشای موڵکی خوا بکە .. خوای پەروەردگار دەفەموێ ((وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّماوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ(٦٧))) (الزمر: ٦٧) واتە (( خوانەناسان قەدری خوایان وەك پێویست نەگرت ، بەمەرجێك هەموو گۆی زەوی پڕ مشتێکی قودرەتی ئەو زاتەیە لە ڕۆژی قیامەتدا ، ئاسمانەکانیش پێچراون ، پاك و بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگارە مەزنەی شایستەی ئەوە نیە نەفامان هاوەڵی بۆ بڕیار بدەن و قەدری نەزانن ))

زەویش یەکسانە بە خاڵێك لە کۆمەڵەی خۆردا ، وە کۆمەڵەی خۆریش یەکسانە بە خاڵێك لە کاکێشاندا ، وە ڕێگای کاکێشان یەکسانە بە خاڵێك لەناو هەزاران کاکێشاندا .

وە هەزاران کاکێشانەکەش یەکسانن بە خاڵێك لە ئاسمانی یەکەمدا .. تۆ یەکسانیت بە چەند لە موڵکی خوای گەورەدا .. تەماشای بکە قەبارەت چەندە و ئیتر چۆن تاوان دەکەیت و سەرپێچی دەکەیت ؟ ئایا نابینیت بیر کردنەوە لە دروستکراوەکانی خوا تۆی گەیاندە کوێ ؟!...

خوای پەروەردگاردەفەموێ ((وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّماوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ(٦٧)))

يقول عبد الله بن عمر : رايت النبي –ص– وهو على المنبر يقول ((ياخذ الله عز و جل سماواته و ارضه بيده فيوقول : انا الله – و يقبض اصابعه و يبسطها – انا الملك ، انا الجبار )) يقول ابن عمر : حتى نطرت الى المنبر يتحرك من اسفل شيء منه حتى اني لاقول اساقط هو برسول الله –ص–))[1] واتە : عبد الله کوڕی عومەر ووتی : پێغەمبەر –ص– م بینی لەسەر مینبەر دەیفەرموو ((خوای پەروەردگار ئاسمانەکان و زەوی لەناو لەپی دەستیدا هەڵدەگرێت و دەفەرموێ : من خوام – پەنجەکانی دەنوقێنێ و دەیانکاتەوە –من خاوەنی هەموو شتێکم ، من بەدەسەلاتم ، ابن عمر ووتی : تا ئەو ڕادەی تەماشای مینبەرم کرد شتێك

[1] اخرجه مسلم ( ٢٧٨٨) ن و ابن ماجة (١٩٨)

لە خواریەوە دەجولا تائەو ڕادەیەی من دەم ووت : ئایا ئەوە دەکەوێت بەسەر پێغەمبەردا))

مینبەرە تەختەکە لە ترسی خوای گەورە هاتە لەرزین وە ابن عمر دەڵێ : خەریکە مینبەرەکە دەکەوێ بەسەر پێغەمبەردا ، وە پێغەمبەریش —ص— دەنگی بەرز دەکاتەوەو ناوە پیرۆزەکانی خوا دەڵێتەوە .

تەختەو بێ گیان دێنە جوڵە لە ترسی و گەورەیی پەروەردگار ، ... بەڵام دڵەکان ڕەقن ، دڵەکان بێ گیانن لەخوای بالآدەست ناترسن .. بێگیانەکان هەست دەکەن و دڵەکانمان هەست ناکەن .. تەماشای مەزنی موڵکی خوا بکە .. زانایان دەڵێن — تا ئەم موڵکە مەزنە بناسیت — بۆ ئەوەی خۆر یەك خول تەواو کات بە دەوری سەنتەری کاکێشاندا پێویستی بە دوو سەد و پەنجا ملیۆن ساڵ هەیە .. ئەمە چی یە ؟ .. ئەی ئەبێ حاڵی کاکێشانەکەمان لەگەڵ کاکێشانەکانی تردا چۆن بێت، ئەی ئەو کاکێشانانەی تا ئێستا نە دۆزراونەتەوە !...

گوێ لەم فەرموودەی پێغەمبەر —ص— بگرە تا تێبگەیت ، وە فەرموودەکە ئەمە ماناکەیەتی (( ئاسمانی یەکەم بە نیسبەتی ئاسمانی دووەمەوە تەنها وەکو پیچەکە بەردێك وایە لە بیابانێکدا — کێ فێری کردیت ئەی پێغەمبەری خوا— وە ئاسمانی دووەم بە نیسبەت ئاسمانی سێ یەمەوە هەروایە ، وەتەماشای موڵکی پەروەردگار بکە چۆن فراوان ئەبێت تەنها وەکو دەنکێك وایە لە بیابانێکدا وە سێیەمیشیان بە نیسبەت چوارەمیانەوە وەکو دەنکێك وایە لە بیابانێکدا وە لە ئاسمانی چوارەمەوە بۆ ئەوەی ئاسمانی یەکەم ببینن پێویستیان بە میکرۆسکۆب

هەیە ، ئەی چۆن تۆ دەیبینیت؟ وە ئاسمانی چوارەم بە نیسبەت ئاسمانی پێنجەمەوە تەنها وەکو دەنکێك وایە لە بیابانێکدا ، وە پێنجەم بە نیسبەت شەشەمەوە تەنها وەك دەنکێك وایە لە بیابانێکدا ، وە شەشەم بە نیسبەت حەوتەمەوە تەنها وەك دەنکێك وایە لە بیابانێکدا ، وە حەوتەمیش بە نیسبەت کورسیەوە تەنها وەك دەنکێك وایە لە بیابانێکدا ((وسع كُرسيُهُ السَمَاوَاتِ وَ الأرض)) البقرة /٢٥٥) واتە : فەرمانڕەوایی و دەسەلأت و زانینی ئەو زاتە هەموو ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە ))

وە کورسیش بە نیسبەت عەرشەوە وەك دەنکێك وایە لە بیابانێکدا ، وە عەرشیش بە نیسبەت لە پی دەستی ڕەحمانەوە وەك دەنکێك وایە لە بیابانێکدا )) [1] – لا اله الا الله –

بینیت چەندە تۆ کەمیت لەگەڵ ئەوەشدا سەرپێچی خوا دەکەیت و لەکاتێکدا ڕۆزیمان دەدات ، چی وای کردووە پەروەردگار بەو شێوەیە گرنگیمان پیّ بدات ... فریشتەکان ڕەحم بە مرۆۃ دەکەن ، وە قورئان لە ئاسمانەوە دابەزیوە تا خێریان بگات و دایانمەزرێنێت ، وە بەهەشتیش ئامادە کراوە بۆیان تا بچنە ناوی لە ئەنجامی پەرستشەکانیانەوە ، وە ئەتانپارێزیّ لەسەر پێچی و دات دەپۆشیّ و دەستت دەگریّ لەکاتێکدا پێویستی بە تۆ نیە .. ئێوە هەژارن هەژاریەکی ڕەها ... تەماشای ئەو

---

[1] ئەمە سیاقی فەرموودەکەیە بە مانا ، وە فەرموودەکە زۆر لە کورترەکە باسکرا..اخرجه ابن حبان ( ٢ / ٧٧) ، ابو حمد الاصبهاني في العظمه( ٢ / ٥٧٠) و ابو نعيم في الحلية ( ١ / ١٦٧ ) .

ڕووبەرە بکە کە تیایدا دەژی لە موڵکی خوا ، وە پەروەردگار بە ڕەهایی پێویستی پێم نیە ،

پەروەردگار دەفەرموێ ((أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا(٢٧)رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا(٢٨)وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا(٢٩)وَالأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا(٣٠) (٣٠) )) النازعات / ٢٧-٣٠) واتە : (( ئایا زیندوو کردنەوەی ئێوە سەختترە یان بەدیهێنانی ئەم ئاسمانە ، بەبەرزیەوە ڕایگرتووە و بە ڕێك و پێکی بەدیهێناوە ، شەو گارەکەی تاریك کردوە و کاتی چێشتەنگاویش ڕووناك خۆری دەرخستوە ، دواتر زەویشی بە شێوەیەکی هێلکەیی بەدیهێناوە )) .... پەرستراو نیە بیجگە لە خواو پاك و بێ گەردی بۆ خوا .. وە لەگەڵ ئەوەدا لەگەڵ ئەو هەموو موڵکە زۆرەو ئەو ڕووبەرە بێ کۆتاییە ، پێغەمبەر -ص- دەفەرموێ ((اطت السماء اطت السماء وحق لها ان تئط ما فيها موضع اربع اصابع الا و ملك واضع جبهته ساجد لله)) [1] واتە : ئاسمان توانای نەماوە خۆی ڕابگرێت ، وە هەقی خۆیەتی کە توانای خۆڕاگرتنی نەمێنێت ، چونکە هیچ شوێنێکی نەماوە کە جێگای چوار پەنجەی تێدا بێتەوەو فریشتەیەك تەوێڵی نەنەواندبێتەوەو سوجدەی بۆ خوا نەبردبێت)) گەردوون هەمووی بەندەی خوای پەروەردگارە .. تەنها تۆ نەبیت ئەی ئادەمیزاد ئایا ئەمە ڕاستە ! با خەڵکی بڕۆن و سەرپێچی خوا بکەن بەلاّم تۆنا دوای ئەوەی ئەمەت بیست ، وە لە فەرمودەیەکی تردا لە جابرەوە -رض- پێغەمبەر-ص- دەفەموێ(( ما في السماوات السبع موضع قدم

---

[1] اخرجه الترمذي ( ٢٣١٢) و ابن ماجة ( ٤١٩٠) و احمد ( ٢١٠٠٥) عن ابي ذر-ر ض )

ولا شبر ولا كف الا وفيه ملك قائم او ملك ساجد او ملك راكع فاذا كان يـوم القيامـة قـالو جميعـا : سبحانك مـا عبـدناك حـق عبادتـك !))[1]
واتە (( لەهەر حەوت ئاسمانەكەدا نە جێ پێیەك نە جێ بستێك نە جێ لـەپی دەسـتێك نـەماوە كـە تیایـدا فریـشتەیەك نـەبێت بـە پێـوە یـان فریـشتەیەك لـە سـوجدەدا یـان فریـشتەیەك لـە ڕكوعـدا ، وە كـاتێكیش قیامەت دادێ هـەموویان دەڵێن : پاك و بێگـەردی بۆتـۆ ئـەی پـەروەردگار هەقی تەواومان پێ نەدایت لە پەرستندا . ئەبێ ئەو كەسە چۆن بێت كە شەو و ڕۆژ سەرپێچی و تاوان دەكات .

## ئەستێرەكان

تەماشـای ئاسمـان و زەویمـان كـرد ، بـا تـەماشـای ئەسـتێرەكان بكەین ، ڕێگای كاكێشان – وەك پێشتر باسكرا – پێكهاتووە لە دوو سەد بلیـۆن ئەسـتێرە ، ئەگـەر لـە بیابانێكـدا بەشـەودا بڕۆیـت یـان بەشـەو دا لەسەربانی ماڵـەوەت وەسـتا بیـت و تەماشـای ئاسمـان بكـەیت ، بێگومـان ئەستێرە دەبینیت ، وە ئەوە یەك ئەسـتێرە نیـە بـەڵكو تـۆ گومـان دەبـەیت كـە یـەك ئەسـتێرەیە بـەڵكو بریتیـە لـە ملیۆنـەها ملیـۆن ئەسـتێرە ی نزیـك لەیەك وەك ژمارەی دەنكە زیخی بیابان ، وە دوای ئەوە وا گومان دەبـەیت كە یەك ئەسـتێرەیە لـە ڕاسـتێدا ملیۆنـەها ملیـۆن .. تەماشـای ئـەو قـەبارە بـی كۆتاییـە بكـە ، وە هـەر كۆمەڵـەیـەك لـەو ئەسـتێرانە لەگـەڵ یەكتریـدا هەزاران ساڵیان بەسەردا چووە بەشێوەیەكی نەگۆڕ نـاجوڵێن شـەوو ڕۆژ

---

[1] اخرجه الطبراني في الاوسط ( ٣٥٦٨) ، وفي الكبير ( ١٧٥) وە تەماشای مجمع الزوائد بكە ( ١ / ٥٢ )

یان پێ دەناسرێتەوە وەهەروەها ئاڕاستەکانیشیان پێ دەناسرێتەوە ... خوای گەورە دەفەموێ ((فَلاَ أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ(٧٥)وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ(٧٦)) (الواقعة ٧٥-٧٦) واتە: ( سوێند بەشوێنی ئەستێرەکان ، بێگومان ئەو سوێندە ئەگەر بزانن سوێندێکی زۆر گەورەیە )) کاتێ دەزانن و لێدەکۆڵنەوە و تەماشا دەکەن دەزانن کە ئەوە سوێندێکی گەورەیە کەخوای گەورە سوێند بە ڕیز بەندی شوێنی ئەستێرەکان بخوات .. پاك و بێگەردی بۆ بەدیهێنەری مەزن ... سبحان الله – دەرکەوتووە کە هەندێ لە ئەستێرەکان دەسوڕێنەوە بەدەوری زیاتر لە یەك خۆر ، واتە دەسوڕێنەوە بەدەوری دوو خۆردا ، لێرەوە تێدەگەین لە ئایەتی ((رب المشرقين و رب المغربين)) الرحمن /١٧ ) واتە (( خوا خاوەنی هەردوو ڕۆژهەلآت و هەردوو ڕۆژ ئاوایە ))

وەهەندێ لەو ئەستێرانە دەسوڕێنەوە بەدەوری سێ خۆردا لێرە تێدەگەین لە ئایەتی (( فلا اقسم برب المشارق والمغارب )) المعارج /٤٠) واتە ( سوێند بە پەروەردگاری خۆرهەلآتەکان و خۆرئاواکان )) کاتی خۆی نەیاندەزانی چۆن تەفسیری بکەن ئایا خۆرهەلآتەکان یانی چی لە کاتێکدا یەك خۆرهەلآت هەیە ... پاك و بێگەردی بۆ خوای مەزن ..

## دووکەڵ

لە تەلیسکۆبە نوێکانەوە شتێکی سەیریان بینی یەوە ، بینیان کە بڕێکی زۆر لە تەپ و تۆز و خۆڵو دووکەڵ کە ئاسمانەکانی پڕ کردووە هەندێ لە تەلیسکۆبەکان پانتاییەکان مەزەندە کرد بە دووسەد ساڵی ڕووناکی – پانایی دووسەد ساڵی ڕووناکی ؟ نێوانی ئێمەو ئەو

دوکەڵە نزیکەی نۆ هەزار ساڵی ڕوناکیە ، وە ئەو دوکەڵە درێژ دەبێتەوە بۆ ڕوبەرێکی فراوان کە ناژمێردرێت ، وە دەر کەوتووە کە ئەستێرەکان لەو دوکەڵە دروست بوون ، لە ئەنجامی کارلێکی کیمیایی لەناو ئەو دوکەڵەدا ئەستێرەکان دروست بوون ... بەمە تێدەگەین لەم ئایەتە پیرۆزە ((ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ(١١))) فصلت /١١ واتە (( ئینجا وویستی ئاسمان ڕێك بخات و دروستی بکات لە کاتێکدا کە دووکەڵ بوو ، فەرمووی پێ ی و وە بە زەویش فەرمانبەدارو مل کەچ بن ، هەردوولا خێرا ووتیان : ملکەچی تۆین و چۆن دەفەرموویت وادەکەین ))

خوای گەورە دەفەرموێ ((وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ)) اعراف /٥٤واتە (( خۆر و مانگ و ئەستێرەکان بەفەرمانی خوا کەوتونەتە گەڕ لە فەرمانی دەرناچن ، ئاگادار بن کە هەرچی دروستکردن وبڕیار دانە بۆ ئەوە ))

لەم ئایەت تێ بگە ((وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ)) ناتوانن هیچ شتێ بکەن ، ئایا خۆر دەتوانێ چرکەیەك دوا کەوێ لەوەی کە خوای گەورە فەرمانی پێداوە ، هەموو ڕۆژێ لەهەمان کاتدا ووردەکاریەکی زۆر ورد ((والشمس والقمر والنجوم مسخرات بامره)) گوێ لەم ڕستەیەی تر بگرە (الا له الخلق )) وە چی تر ((والامر)) واتە ئەوەی کە دروستکەرە هەر ئەویش فەمان دەردەکات .. دروست دەکات و دەپەرسترێت ، ئەوەش بەدیهێنەرە ئایا کەسی تر دەپەرسترێ !.. ئەو ڕۆژی دەرە ئایا سوپاسی کەسی تر دەکرێ !.. چۆن؟.. ( الا له الخلق والامر )) خوای گەورە دەفەموێ ( فسبحان الذی بیده مَلَكُوتُ كُلِ شَیء و الیهِ تُرجَعُون ) یس /٨٣

## فراوان بوونی گەردوون

زانایـان شـتێکی تـری سـەر سـوڕهێنەریان لـە ئاسمانەکانـدا دۆزیەوە ، دۆزیانەوە کە گەردوون جێگیر نیە ، بەڵکو دەکشێت ، هەموو ڕۆژێ مەجـەڕەکان لـە یـەکتر دوور دەکەونـەوە وە ئەسـتێرەکان دوور دەکەونـەوەو گـەردوونیش بـە ئەندازەیـەکی زۆر دەکـشێت .. شـتێکی سـەیرم خوێنـدەوە زانایـان وای مەزەنـدە دەکـەن کـە گـەردوون لەهـەر خولەکێکدا ملیۆن تریلیۆن ساڵی ڕووناکی گەورە دەبێت ... ئایا دەتوانی وێنـای قـەبارەی ئـەو فـراوان بوونـە بکـەیت کـە لەهـەر خولەکێکـدا ڕوو دەدات .. ئـەوە مـوڵکێکی بـەر فراوانـە کـەوا لـە عـەقڵت دەکـات سەرسـام ببێـت گـوێ لـە ئایـەتی پـەروەردگار بگـرە ((وَ الـسَّمَاءَ بنيناهـا بايـد وانـا لموسعون )) الذاريات /٤٧ (( ئێمـە ئاسمانمـان بەدەسـتی قـودرەتی خۆمـان دروست کردووەو بەردەوامیش گەورەو فراوانی دەکەین ))

## بەرگی هەوایی

ئـەو بەرگـە هەواییـە دەورەی گـۆی زەوی داوە ، ئێمـە بەهاکـەی نازانین ، وە ئەگەر ئەو بەرگی هەواییە نـەبێت کـە دەوری زەوی داوە ئـەوە نیازکە هاتووەکـان لـە ئاسمانـەوە بـە چەند چرکەیەك گۆی زەوی خـاپور دەکـەن ، وە هـەر نیازکێك لـە ئاسمانـەوە بێـت لـە چـەند سـاتێکی کەمـدا زەوی خـاپور دەکـات .. نیازکێـك لـە بیابـانی ئـەریزۆنا لـە وولاَتـە یەککگرتووەکان کەوتە خوارەوە و بەرگی هەوای بڕی ، وە دەڵێن قـەبارەی ئەو چاڵە نەیزکیەی دروسـتی کـرد تیرەکـەی دوانـزە هـەزار مـەتر بـوو ، وە قوڵیەکـەی شـەش سـەد پـێ بوو ، وە کێشەکەی پـەنجا هـەزار تـەن بـوو ،

ئەوە تەنها یەك نیازكە كە كەوتووەتە سەر زەوی بە خێرایەكی لە ڕادەبەدەر و هێزێكی كەم وێنە ... ئاگرێكی بڵێسەدار ، كێ ڕێ لەو نیازكانە دەگرێت كە بەرمان نەكەون .. ئەوە بەرگی هەوایییە.. گوێ لە ئایەتی قورئانی بگرە ((وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَحْفُوظًا وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ(٣٢))) انبياء /٣٢ واتە : (( ئێمە ئاسمانمان كردووە بە سەقفێكی پارێزراو ، كەچی ئەوانە ڕوو وەردەگێڕن لە هەموو نیشانەو بەڵگەكانمان ))

## ئاسمان

با دابەزین بۆ سنوری چا و و تەماشای جوانی دروستكردنی ئاسمان بكەین .. ئایا ڕەنگەكانت بینیوە .. ئایا ڕەنگەكانی خۆرهەڵاتنت بینیوە .. سوێندتان ئەدەم ئایا نەدەتوانرا ئاسمان تەنها پێك بهاتایە لە دوو ڕەنگ تەنها سپی و ڕەش ... تەماشا كە چۆن پەروەردگار جوانی كردووە و تەماشاكە چۆن ڕازاندوویەتیەوە .. تەماشای ڕەنگە جوانەكان بكە لە ئاسماندا .. تەماشایكە چۆن ئەو ڕەنگەی بۆ هەڵبژاردووە كەسەرنج ڕاكێشە ، ئەگەر ڕەنگەكە ڕەش بوایە ئەوە مرۆڤی دڵ تەنگ دەكرد ، بەڵام ئەسڵ لە ڕۆژدا بریتی یە لە ڕەنگی ئاسمان وە لەكاتی خۆر هەڵهاتن و خۆر ئاوابووندا دەگۆڕێت..

ڕەنگی جۆراو جۆر.. بۆچی خوا هەموو ئەم ڕەنگانەی گۆڕی ... بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی ..

بەدیهێنەری بوونەوەرە .. ئەگەر شتێ دروست بكات باشی ئەكات و جوانی ئەكات .. ئایا دروستكراوی خوات بینیوە ، دەی

تەماشـای دروسـتکراوی خـوا بکـە و جـوانی دروسـتکراوی خـوا .. بـراو خوشکانم فرسەت دەن بە چاوەکانتان با عیبادەت بکات ، ئەو چاوانە ، سالأنێکیان بردۆتە سەر بە تاوان کردن و سەرپێچیکردنی خوا وە ئاواتە خوازن عیبادەت بکەن ، چاوەکانت ئاواتە خوازن کە خوا بپەرستن بەلأم تـۆ فرسـەتی ئـەوەیان نـادەیتیٚ .. واز لـە چـاوەکانت بێنـە کـەمێك خـوا بپەرستن

ڕابمێنـــە لـــە دروســـتکراوەکانی خـــوا وە تەماشـــای جـــوانی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بکە

پەروەردگار دەفەمویٚ ((أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا))

واتە (( ئایا ورد نەبوونەتەوە لەو ئاسمانەی کە بەڕاسەرتانەوەیە ، چۆنمان دروست کردووە و ڕازاندوومانەتەوە ))

تەماشاکە چۆن ئەو ووشانە هاوسیٚ یەتی لەگەلٚ عـەقلٚت و دلٚتـدا دروسـت دەکـەن .. ئایـا کـاتیٚ لـە قورئـان دەخوێننـەوە بـیر لـەم مانایـە ناکەنـەوە ...(( أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا)) ق:٦ واتـە ئایـا وورد نەبوونەتـەوە لـە و ئاسمانـەی کـە بەڕاسـەریانەوە یـە چـۆنمان دروسـت کـردووە و ڕازاندوومانەتـەوە بـە جۆرێـك هـیچ کـەم و کـوڕی و کەلێنێکی تێدا نیە .

ئایـا ڕۆژیٚ لـە ڕۆژان تەماشـای ئاسمانـت کـردوەو شـتێکت تیـا بینیبێت لە چەشنی درز یان کووندا خوای گەورە دەفـەرمویٚ ((تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ(١)الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ

أَحْسَنُ عَمَلاً وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ(٢)الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَانِ مِنْ تَفَاوُتٍ)) الملك (١-٣) واتە : موبارەك و پیرۆزە ئەو زاتەی کە هەموو بونەوەری بەدەستە ، ئەو زاتە دەسەلآتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ، هەر ئەو مردن و ژیانی بەدیهێناوە تا تاقیتان بکاتەوە کێتان کردەوەی چاك و پەسەند ترە هەر ئەویش زاتێکی بالآدەستە بەسەر بێباوەڕاندا ، وە لێبووردەیە هەر ئەو زاتە ئاسمانەکانی بە حەوت چین دروست کردوە ، لە نێو بەدیهێنراوەکانی خوادا هیچ ناڕێکیەك نابێت تفاوت : واتە : هەر ناتەواویەك یان هەر کارێکی خراپ سروشتی نیە ( مالری فی خلق الرحمن من تفاوت فارجع البصر ) سەر لەنوێ تەماشا کە (فارجع البصر هَل تَرى مِن فُطور ) ( الملك -٣) واتە : ئەی مرۆڤ هەر چاو بگێڕەو سەرنج بدە بزانە چ درزو کە م و کوڕیەك بەدی دەکەیت ) , ئایا هیچ هەڵەیەکت ئایا هیچ کونێکت بینی بە ئاسمانەوە بێت (( فارجع البصَر هَل تَرَى مِنْ فطور ثم ارجع البصَرَ كَرَّتين) ، هەروەها دووجار سەیرکە (ثم ارجع البصر كرتين ينقلب اليك البصر خاسئا ) هیچ هەڵەیەك نابینی لە دروستکراوەکانی خوای پەروەردگار (( صنع الله الذى اتقن كل شىء )) (النمل-٨٨) واتە : ئەمەیە دەست کردی ئەو خوایە ی کە هەموو شتێکی بەو پەڕی ڕێکو پێکی دروست کردوە ((ثُمَّ ارْجِعْ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ(٤) وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِلشَّيَاطِينِ)) (الملك ٤-٥) واتة (( پاشان چەند جارێك چاو بگێڕە سەرسام و ملکەچ دەبێت چاوت بەنائومێدی دەگەڕێتەوە لەکاتێکدا کە چاوت ماندووە و پەکی کەوتوە (٤) سوێند بەخوا ئێمە

ئاسمانی دنیامان کردووە بە چراخان بەو ئەستێرانە شەیتانەکان ڕاودەکەین )) ئەوەیە دروستکراوی پەروەردگار .. چەندە لەگەڵ ئەم چەمك و واتایانەدا بژیت باشتر خوا دەپەرستیت ، چەندە زیاتر خۆشت بوێ ، زیاتر هۆگر دەبیت و زیاتر هاودەمی دەبیت ، چەندە تەماشای دروستکراوەکانی خوا بکەیت زیاتر لە خوا دەترسیت .. ئەوانە کێن کەلێیان دەترسن .. ئەوانە هەژارن و هەمووومان هەژارین .. ئایا دەگونجێ لە دروست کراوێك بترسم لە کاتێکدا پەروەردگار دروستکەری ئاسمان و زەویە .. تەماشاکە چۆن عەقیدەیەکە ئەوە ئەو بیرکردنەوەیەیەکە درەبارەی دەدوێین . ئەگەر لە هەموو ئەمانەی پێشوودا کەباسمان کرد بەختت نەبوو تەنها ئەوەنەبێ باران ببینیت و گوێت لە هەورە گرمە بێت و بەدوای یەکاهاتنی شەوو ڕۆژ ببینیت .. ئیتر جیاوازی تۆو ئاژەڵ چی یە .. چونکە ئاژەڵیش ئەو بەشەی هەیە کەزانی شەو و ڕۆژ بەدوای یەکدا دێن ، دەنوی چۆن هەڵ دەستێتەوە ئیتر فەزڵی تۆ بەسەر ئاژەڵدا چی یە .. سوێندت ئەدەم . لە ڕیزی ئاژەلآن بەرز بەرەوەو بەرەو مەلەئی ئەعلی بڕۆ . تەماشای جوانی و ڕازاوەیی دروستکراوەکانی خوا بکە ، وە پەیوەندی بە پەروەردگارەوە بکە و خۆشت بوێ .. ڕاستە ئەگەر خەڵکی بیر مە لە مەزنی پەروەردگار بکەنەوە هەرگیز سەرپێچی خواناکەن ..

## زەوی

دوای ئەوەی قسەمان کرد دەربارەی ئاسمانەکان و چۆن ژیان و دروستکراوەکانی دەستی پێکرد وە زەوی بەرەو چی کۆتای دێت ، با بچینە ناو خودی زەویەوە . تەماشای سەرزەوی بکەو بۆچی خوای گەورە زەوی هەڵبژاردووە تا نیشتەجی بین تیایدا .

ئێمە یەکێکین لە هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر ، وە حەوت هەسارەی تر هەیە ، وە بۆچی لەسەر هەسارەیەکی تر دروستی نەکردووین .. کاتێ گوێت لێ دەبێ کە خوای گەورە زەوی بۆ ڕەخساندوین ، وە چەندین ئایەتی زۆر هەیە کە ئاماژە بەوە دەکات کە زەوی ((مهد )) و ((مهاد و (بساط ) مستویه )) و (سهله واتە (لانکە و بێشەیە و (ڕاخراوە و تەختایی ) یە ئاساییە ، وە بەشێوەیەك دەژین لەسەری ، لەم کاتەدا تەماشای هەسارەکانی تر بکە تا بەهای زەوی ئەو زەویەت بۆ دەرکەوێت کە لەسەری دەژین .

بۆ نموونە – هەسارەی یەکەم ، کە بریتییە لە هەسارەی عەطارد (زاو) ، ئەم هەسارەیە زۆر بەهێواشی بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە ، ڕۆژ تیایدا زۆر درێژە ، وە ئەو لایەی کە ڕووی لە خۆرە لەم هەسارەیەدا پلەی گەرماکەی دەگاتە حەوت سەد پلەی سەدی ، وە ئەو ڕوەشی کەڕووی لە خۆر نیە پلەی گەرماکەی دەگاتە سەدو پەنجا پلە لە ژێر سفرەوەو .. کاتێ پلەی گەرما دەگاتە چلی سەدی پرسیار دەکەن بۆچی ئەمڕۆ پلەی گەرمی بەرزە ؟ بەڵام تەماشاکە چۆن پەروەردگار ئەم زەویەی بۆ هەڵبژاردوویت . تەماشای هەسارەی دووەم

بکە : مەریخ ، قەبارەی مەریخ نزیکە لە قەبارەی زەویەوە ، وە کەشتیە ئاسمانیەکان لە سەری نیشتوونەتەوە ، ئەی بۆ نەچین نیشتەجێ بین تیایدا ! بەمەریخ دەڵێن هەسارە سوورەکە .. بۆچی ؟ چونکە تەنراوە بە تەپ و تۆز ، .. وە خێرایی با تیایدا ٢٠٠ میلە لە سەعاتێکدا .. وە پڕە لە گەردەلولی لم و زیخ و کە تەپوتۆز دەسازێنن و وای لێ دەکات ڕەنگەکەی پرتەقاڵی بێت ، هەسارەیەکی بێ ئاوە ، بورکانی زۆری تیادا ڕوودەدات ، وە بەرزی بورکانەکان تیایدا دەگاتە نەوەد هەزار پێ ، دەی ڕابمێنە بیر بکەرەوە چۆن پەروەردگار زەوی بۆ هەڵبژاردویت ،ئایا ڕەحمی خوا دەبینیت .. دوای مەریخ هەسارەی موشتری دێت ، وە قەبارەکەی یەکسانە بەدەیان ئەوندەی قەبارەی زەوی ، وە کێشەکەی یەکسانە بە کێشی زەوی و هەموو هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر ، بەلاّم هێزی ڕاکێشانی یەکسانە بە پێنج سەد ئەوندەی هێزی ڕاکێشانی زەوی ، لەبەرئەوە کولاّنێکی زۆر سەخت لەوێدا هەیە ، وە بورکانەکانی لە هەر چرکەیەکدا دەتەن لە گۆگردی تواوە فڕێ دەدا ئایا دەتوانی وێنای ئەو فڕێدانە بکەیت کە لێ یەوە دەردەچێت بە ڕادەیەکە زانایانی زەوی وا گومانیان دەبرد کە ئەوێ شوێنی دۆزەخە ، بێگومان هیچ بەڵگەیەك نیە بۆ ئەوە .. بەلاّم ووشەی دۆەخ بەو مانایەی کە لکاوە بەیەکەوە ئەو ووشەو مانایە هەڵدەگرێ دەڵێن لەزۆریی کولاّنیدا ناوەوەی دێتە دەرەوەی و هەندێکی هەڵدەگەڕێتەوە بەسەر یەکتریدا ئەوەش نزیکە لە سیفەتی دۆزەخ .. وەبەسەرهاتی دەتەن لە گۆگردی تواوە . کە لێ ی دێتە دەرەوە نزیکە لەو وەسفەی کە لە قورئاندا هاتووە بۆ وەسف کردنی

دۆزەخ .. پەروەردگار دەفەرموێ:((انها ترمی بشرر كالقصر))المرسلات:٣٢ ..واتە:بەڕاستی ئەو ئاگرە بڵێسەیەك فڕێ دەدات,وەك كۆشك و تەلارێكی‌گەورە, مەزنە......من نالێم : دۆزەخ موشتەری یە ... بەڵام دەمەوێ تەماشای ڕەحمەتی خوابكەن كەئێمەی دروست نەكردووە تالەوێدابژین . زوحەل ( كەیوان) هەسارەیەكی زۆر سوكە هیچ شتێ لەسەری جێگیرنابێ وەئەگەربەهێواشی لەسەر ڕوباری نیل داینێیت , ژیان لەسەری ئەستەمە . هەردوو هەسارەی (نیوتن) و(نبتون) هەریەكەیان زۆردوورن لەخۆرەوە وەژیان تیایاندا سەهۆڵبەندانەو ترسناكەو تەنهاسەهۆڵی تێدایە .... شایەت ئەوەیە ... تەماشاكە چۆن خوای گەورە زەوی بۆهەڵبژاردووین ... تەماشاكە چۆن ڕای خستووەو كردوێتی بەلانە , كێ كانی و ڕووبارەكانی تیادا خولقاندوە... ئایابیرمان دەچێ كەنیعمەتی پەروەردگارە یان چی ؟... ئایابیرمان دەچێ ئێمە موڵكی كێین یان چی ؟ كاتێ پەروەردگار لەگەڵماندا دەدوێ بەچەندین ئایەتی مانائاسان كەپێویستی بەشتی ئاڵۆزنیە بۆتێگەیشتن لێی , چی دەفەرموێ ؟ دەفەرموێ ((قل أرأيتم أين أصبح ماؤكم غوراً فمن يأتك بماء معين )) الملك\30 واتە ((پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ ئەگەر ئاوەكەتان ڕۆچوو كێ دەتوانێ ئاوی سازگارتان بۆبەدەست بێنێ (( ئایادەزانن مانای (غورا) چی یە ؟ چی ئەكەن ئەگەر زەوی ئاوی ناوخۆی قوٗرخ بكات و نەیڕژێنێ بەسەرزەویدا , چی ئەكەن ئەگەر زەوی ئاولوش بدات ؟ ئەگەر ئاوەكانتان ڕۆچوو , كێ‌دەتوانێ ئاوی‌سازگارتان بۆبەدەست بێنێ؟!(( افرأتم الماء الذى تشربون (٦٨) أأنتم أنزلتموه من المزن أم نحن المنزلون

(٦٩) لونشاء لعجلناة أجاجا فلولا تشكرون )) الواقعه / ٦٨_٧٠واتـه ((ئـەی سـەرنجی ئـەوئاوەنادەن کـه ڕۆژانەچـەندجاردەیخۆنەوە, ئایـائێوە داتـان بەزانـــدوە لەهەورەکانــەوە یـــان ئێمەدابەزێنـــەرین, ئەگـــەر بمانویـــستایەئەوئاوەمان دەکـــردە خـــوێ یـــەکی تـــاڵو ســـوێر جائایابۆسوپاسگوزاری ناکەن )) ئایابیرت لەم ئایەتەکردۆتەوە , ئایابیرت کردووەتەوە کەپەروەردگاردەتوانێ ئاولەئاسمانەوەبەسوێری ببارێنێت ؟ !ئایابۆبیرت نەکردووەتەوە بەوشێوەیە , چیمان بکردایە ئەگەر بەسوێری ببارییایـە ؟ ! دەمـانتوانی مـاوەی چـەند بەوشـێوەیە بمێنینـەوە ... دوای ئـەوە ژیـان لەسـەرزەویدا کۆتـایی دەهـات , نەکـشتوکاڵو نـە ڕووەك و نـەئاژەڵ و نـەمرۆڤ نـەدەمان : زۆربەئاسـانی ... پـەروەردگار بەیـەك سـات دەتوانـێ بەهیلاکاندابـەرێ بـەلام بۆچـی بەهیلاکمانـدا نابـات, ئەوزاتـە دانایـەو بـەئارام و لێبوردەیـە, لێـی دەبورێـت و لێ ی خـۆش دەبـێو ئـارام دەگـرێ .. لەگوناهـەکان دەبورێـت و دەزانـێ چیدەکەن ,سبحانەوتعلی_ لاالەالااللـە . باکـەمێ دابـەزین و تەماشـای زەوی و سروشتەسـەیرەکەی بکـەین ! ئێمەشتەپاشـەڕۆکان و لاشـەی مـردوان دەخەینـە ناوزەویـەوەو دەیشارینەوە , ئەویش بەروبوممان بۆ دەردەکـات , ئێمـە شتە پیسەکان دادەشارین تیایداوئەویش شتی جوانمان بۆبەرهەم دێنێ.. ئەوشوێنەی شـتی پیـسی تیادەشـاردرێتەوە بەرهـەمی باشـی دەبێـت و ئەوپیـساییە دەبێتـەهۆکارێك بۆگەشـەکردنی بەروبومـەکان .. دەنکـە تۆوێـك دەچێنیت کەچـــــــی بـــــــەروبومێکی زۆردەچـــــــــنیتەوە.. تەماشاکەچۆن خوابەرەکـەتی خـستوەتەسەرزەوی. باتەماشـای ڕووەك و

بەروبوومەکان بکەین ئایا تەماشای جۆرەکانیت کردووە کەهەزاران جۆرە ... تەماشای ڕەنگی میوەجات بکە , تەماشای ڕەنگی جیاوازو تامی جیاوازو خواردنی جیاوازبکە , سەیرتر لەوە خاکەکە یەکەو ئاوەکە هەمان ئاوە , ئەی چۆن بەروبومەکان تامیان جیاوازە ! پەروەردگاردەفەرموێ((وَفِي الأَرْضِ قِطَعٌ مُتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ(٤))) الرعد/٤ واتە

(( لەسەر ڕووکاری زەوی پارچەی جۆراو جۆر هەیە لە پاڵ یەکدا ، هەروەها باخی ڕەزی تریێ و کشت و کاڵی هەمە جۆر و دار خورمای یەك قەد و دووقەد ، هەموو ئەمانە بەیەك ئاو ئاو دێر دەکرێن و لەیەك جۆر ئاو دەخۆنەوە ، وە هەندێکیانمان لە هەندێکی تر بۆ خۆراکی ئادمیزاد نازدار و پەسەندتر کردووە ، بەڕاستی ئالەو و شتانەشدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك عەقڵ و ژیری خۆیان بخەنەکار ))

کەمێك بیر بکەرەوەو بژی لەگەڵ تواناو دەسلاّتی خواو تەماشای ئەو بەرو بوومە بکەو ئایا کێ ئەو بەروبومەی بۆ دەهێنایت ((أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَحْرُثُونَ(٦٣) أَأَنْتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ(٦٤)لَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَاهُ حُطَامًا...)) الواقعة ٦٣-٦٥

واتە : (( ئایا سەرنجتان داوە لەو زەویەی کە دەیکێڵن و دەیچێنن (٦٣) ئایا ئێوە دەیڕوێنن یان هەر ئێمەین ڕوێنەر و بەرهەم هێنەر (٦٤) ئینجا ئەگەر بمان ویستیایە دەمانکردە چلکەو چەواڵی بێ خێر.. ))

وێنـای بکـە ئەگـەر تـۆ لـە هـەموو سـاتەکانی ڕۆیـشتنندا بـیر بکەیتـەوە ، ئەگـەر ڕەت ببیـت بـەلای کەسـێکی دەردەداردا دەڵێیـت : سبحان الله ، چی ناردی کاتێ من نایبینم ، وە کێ وای لێ کردم خۆشم بوێــت لەکاتێکــدا مــن شــێوەی نــازانم ، ئەگــەر بــژیت لەگــەڵ دروسـتکراوەکانی خـوادا لـە هـەموو سـاتێك و هـەموو چـرکەیەك ئـەوە هەزاران مەعجیزەت بۆ دەردەکەوێت لە لایەن پەروەردگارەوە ..

بابیر لە شتێکی تر بکەینەوە لە زەویدا .. زانایـان دەڵێن شـتێکی زۆر سەیرە ، ئەی چۆن خوای گەورە ئەو هاوسەنگیە سەیرەی لە زەویـدا سـازاندووە ... وە هاوسـەنگی مانـای چـی یـە . واتـە هـەموو شـتێك بەئەندازەیـەکی دیـاری کـراوە ، وە ئەگـەر زەوی کـەمێك گـەورە بوایـە یـان کەمێك بچووك بوایە لەو قەبارەیـەی ئێـستای ئـەوە ژیـانی تێـدا نـەدەبوو ، ئەگـەر زەوی بـچوك بوایـە بـە ئەنـدازەی مـانگ بوایـە ئـەو کاتـە هێـزی ڕاکێشانی شەش یەکی ئێستا دەبوو ، ئەمـەش مانای ئەوەیە هیچ شتێ جێگیر نەدەبوو تیایدا نە ئاو نەهـەوا ، خـوای گەرە وویستی وابووە کە قەبارەکەی بەتـەواوەتی بـەم شێوەیە بێت .. وە ئەگەر قەبارەی گـەورەتر بوایـە ئـەوە هێـزی ڕاکێـشان دەگەیـشتە سـەد و پـەنجا ئەوەنـەی هێـزی ڕاکێشانی ئێـستا ، ئەمـەش کـەمانای ئەوەیـە هـەموو شـتە زینـدووەکانی سەری دەمردن بەهۆی بەرزبوونەوەی پەستانی هەوا .. کەمێك ڕابمێنە لـە قەبارەی زەوی بە ووردەکاریەکی هەستیارەوە ، کەواتـە کـێ دروسـتکەرە ؟ ... کـێ ئـەم کـارە ی کـر د ؟ کـێ ئەمـەی بـۆ هەڵبـژاردین .. ڕابمێنـە لـە دووری خـۆر لـە زەویـەوە ، خـۆر نەوەوسـێ ملیـۆن میل لێمانـەوە دوورە ،

زانایان دەڵێن : ئەگەر خۆر بە ئەندازەی چواریەك لێمان نزیك ببێتەوە وئەوە زەوی دەسوتێت ، وە ئەگەر بە ئەندازەی چوار یەك دوور کەوێتەوە لێمان ئەوە زەوی دەیبەستێت (( وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ )) یس/٣٨ واتە خۆریش لە گەردش و سوڕانەوەی خۆیدا بەردەوامە بەرەو سرەوت دەچێت ، یاخود بەدەوری چەقی خۆیدا دەسوڕێتەوە ، بێگومان ئەوە توانای زاتێکی بالأدەست و زانا دەردەخات )) تویکلی زەوی ئەگەر ئەستوریەکەی بەئەندازەی دەپێ لە ئەستوری ئێستای زیاتر بوایە ، هەموو خەڵکی دەمردن ، وە ئەگەر مانگ کەمێك لەزەویەوە نزیك ببێتەوە ئەوە بەهۆی کشانەوە دەریاکان هەڵی دەلوشین ، وە ئەگەر دوور بکەوێتەوە ئەوە دەریاکان ووشك دەبوون ، کێ داهێنەر و کێ بەتوانایەو کێ سازێنەرە . ,, تۆ بەندەی کێیت ؟ وە پەیوەندیت چی یە بەخواوە ؟ ئایا هەست بە نزیکیت دەکەی لێیەوە یان نا ، ئایا هەست بە فەزڵی دەکەیت بەسەر تەوە یان نا؟ ئایا دەیپەرستیت یان ،؟! .. تا چ ئەندازەەیەك فەرامۆشی کردوویت وە کۆتایی چی یە : ((سبحانه و تعالى عَمَا يُشرِكُون )) الزمر ٦٧ واتە: پاکی و بێگەردی و بڵندی بۆ ئەو پەروەردگارە مەزنەی شایستەی ئەوە نیە نەفامان هاوەڵی بۆ بڕیار بدەن و قەدری نەزانن) وە بەرگی زەوی ئەگەر چینەکەی ناسکتر بوایە لەمە ئەوە نیازکە زۆرەکان دەیان بڕی و ئەو کاتەش لە چەند چرکەیەکدا زەوی دەسوتا .

ڕێژی ئۆکسجین لە بەرگی زەویدا ٪٢١ ە ، ئەگەر کەمێك زیاد بکات ئەوەبە هەر ڕووداوێکی بچوك بادەنکە شقارتەیەکیش بێت زەوی

گڕی دەگرت ، بەلآم ئەم ڕێژەیە وات لێ دەکات سوود لە ئاگر ببینیت و بەکاری بهێنیت بە بێ ڕوودانی سوتانی زەوی . لەسەدا بیست و یەك .. کێ وای لێ کرد لەسەدا بیست و یەك بێت؟ کێ وای لێکرد ئاوابێت ؟ کێ زانایە ، کێ ئەندازە گیرە ؟ پەروەردگار دەفەرموێ ( سبح اسم ربك الاعلى (١) الذى خلق فسوى(٢) والذى قدر فهدى)) الاعلى١-٣) واتە تەسبیحاتی پەروەردگاری بەرزو بڵندت بکە (١) ئەو زاتەی هەموو شتێکی دروستکردووە و ڕێك وپێکی کردووە (٢) وە ئەو زاتەی کە نەخشەی کێشاوە بۆ هەموو شتێك جارێنموویی کردووە ))

بابەتی زانایەکم خوێندەوە -کەزانایەکی بیانی -بوو دەیوت ئەگەر هەموو مرۆڤەکانی سەر زەوی بێنین و کاغەزێك بێنین و دەست بکەیت بە نوسین و هەرچی زانستەکە هەیە بینوسین - هەرچی زانستێ کەخوا هێنابێتیەوە بوونەوە - وە ئەگەر بمانەوێ بینووسینەوە هەرگیز پێ ی ڕاناگەین ودەفتەروکتێبەکان بەشی ناکەن - منیش ووتم :سبحان الله ! زانستی خوا هەرگیز تەواو نابێت ، وە تێڕامان لە دەسەلآتی خواو سەرسامی دروستکراوەکانی کۆتایی نایەت .. خوای گەورە دەفەموێ ((قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا)) الكهف ١٠٩ واتە : دەپێیان بڵی : ئەگەر دەریا هەمووی مرەکەب بێت و زانست و زانیاری پەروەردگارمی پێ بنوسرایە دەریا تەواو دەبوو پێش ئەوەی زانست و زانیاری پەروەردگار تەواو ببێت ، ئەگەر چەندەها ئەوەندەی تر دەریاش بهێنن و بیکەنە مرەکەب ))

پێغەمبەر -ص- دەفەرموێ (( احبو الله لما يغدروكم به من النعم )) [1] واتە (( خواتان خۆش بووێت چونکی ڕۆزی و نیعمەتەکانی پێبەخشیون کەبیخۆن .. زۆر جار مرۆڤ هەست بەشەرم دەکات لەبەردەم پەروەردگاردا ، هەموو ئەم ڕۆزی و نیعمەتانە و هەموو ئەم فەزڵانە و ئێمەش بەم هەموو سەرپێچی و گوناهاکاریەوە ، تیامانا هەیە دەڵێ : قەناعەتم پێ بکە بە فەرمانەکانی خوا .. ئەوەتا خوای گەورە دەفەموێ ( الا له الخلق والامر ) الاعراف ٥٤ واتە : ئاگاردبن و بزانن کە بێگومان : هەرچی دروستکردن و بڕیاردانە هەر بۆ ئەوە ((وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ)) الاحزاب /٣٦ واتە : (( بۆ هیچ پیاو ئافرەتێکی ئیماندار دروست نیە ، کاتێك خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن ، ئەوان سەرپشك بن لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا))

ئایا مولْکی خوات بینیوە ، ئایا ئاسمانەکانت بینیوە !! ئایا زەویەکەیت بینیوە ! ئایا ڕەحمی ئەوت بینیوە بەرامبەر بە تۆ ! ئایا توانایت بینیوە بەرامبەر بەتۆ !

بەشی دووەم : بیر کردنەوە لە دروست کردنی مرۆڤ:

خوای گەورە لە چەندین ئایەتی زۆردا فەرمانمان پێ دەدات بە بیر کردنەوە و دەفەرموێ (( انما يخشى الله من عباده العلماء ))فـاطر ٢٨ واتە .(بێگومان ئەوانەی لەخودایپەروەردگار دەترسن لەبەندەکانی زانایانن) دە توانی ئەو بزانیت بەڕادەی زانین و زانیاریت لە مەڕ

[1] اخرجه الطبراني في الكبير ( ٢٦٣٩ –١٠٦٦٤) لە ابن عباسەوە –ر. ض –

ئاینەكـەت لـە مـەڕ دروسـتكراوەكانی خـوا لەمـەڕ دەسـەلأتی خـوا بـەو ئەندازەیە لە خوا دەترسیت و گویٌ ڕایەڵ دەبیت .. ئێمە ئەم زانیاریانـە باس دەكەین ، تەنهابۆ خوێندنەوە نیە ، ئێمە كـەمێ لـە زانیارەكان باس دەكـەین كـە لـە میانیـەوە دەتـوانین پـەیامێكت بـۆ بنێـرین تەماشـای دەسەلأتی خوای پەروەردگار بكە وە ئامانجمان وەك پیشتر باسمان كرد تێگەیشتنەلە واتای ((وما قدروا الله حق تقديره)) الزمر ٦٧

واتـە وە بـۆ زانینـی قـەدەری خـوا تەماشـای ئاسمانـەكان و زەویمان كرد زانیمان كە باشترین ڕێچكە بۆ ناسینی خوای پەروەردگار بیر كردنەوەیـە لـە دروسـتكراوەكانی .. وە قسەمان لەسـەر ئەوە كرد كـە ئـەم باسـە خـەڵكی پـشتیان تـیٌ كـردووە .. وە ئێمـە پێویـستیمان بـەم پەرستـشە هەیـە – پەرستـشی بیر كردنـەوە لـە دروسـتكراوەكانی خـوا ، پێشتر باسی دروستكردنی ئاسمانەكان و و زەویمان كرد ، وە جوانیی ، دروسـتكراوەكانی خـواو توانـاو دەسـەرلأتی خـوا لـە دروسـتكردنی ئاسمانـەكان و زەوی ، ئێـستاش باسـی دروستكردنی مـرۆۀ دەكـەین .. ئـەی ئادەمیزاد تـۆ چۆن دروست كراویـت بـیر كردنـەوە لـەم واتایـە زۆر گرنگە و زۆر پێویستە..

## دروستکردنی ئادەم _علیەالسلام

یەکەمین شت کە دەستی پێ بکەین لە بیر بکەینەوە لەئادەم _ علیە السلام_ وە پێش ئەوەی دەربارەی چۆنیەتی دروستکردنی ئەو بدوێین کەمێك ڕابمێنە لە دروستکردنی باوکی یەکەمت ئادەم –علیە السلام _ئایەت گەلێکیزۆر دەبینین لە قورئانی پیرۆزدا کە دەربارەی دروست کردنی سەیدمان ئادەم –علیە السلام– دەدوێن ، جارێك دەبینیت لە ئاتێکدا دەفەرموێ لەقوڕ دروستکراوە ، وە جارێکی تر دەڵێ لە خۆڵ ، وە جارێکی تر دەڵێ لە قووڕی جێگیر دروستکراوە وە جارێکی تر دەڵێ دروستکراوە لە قوڕێکی ڕەق وەك فەخفوری دەی ئایا ئادەم لە چی دروستکراوە یەکەمین شتێ کەئادەمی لێ دروستکرابێت خۆڵ بووە ، وە فەرموودەیەکی پێغەمبەر –ص– ئاماژە بەمە دەکات (( ان الله خلق ادم من قبضة قبضها من جميع الارض . فجاء بنو ادم قدر ارض ))[1] واتە : خوای گەورە ئادەمی دروست کردووە لە مشتێك کە لە هەموو زەوی وەرگرتووە ، نەوەی ئادەمیش بە ئەندازەی زەوی و جۆرەکانی دروستی کردووە واتە سیفەتەکانی مرۆڤ وەك جۆرایەتی سیفەتەکانی زەوی جۆراوجۆرە ، ئەو کاتەش کەسایەتیەکی ئاسانی لێ پێکهێناوە وەك زەویەکی بەپیت ، وە کەسایەتیەکی ئاڵۆز و قورسی لێ پێك هێناوە وەك ئەو زەویەی کە ڕووەکی تیا نابێت و ئاو وەرناگرێت ، وە هەروەها کەسایەتیەکی سەرسەختی لێ پێك هێناوە ، بۆیە جۆرایەتی سیفاتەکانی

[1] اخرجه ابو داود ( ٤٦٩٣) ، و الترمذى (٢٩٥٥) ، واحمد( ١٩٠٨٥) لة ( ابو موسى) وە –ر . ض –

مـرۆڤ وەك جۆرایـەتی سـیفەتەکانی زەوی وایـە ، کـە لەهـەر هـەمووی ئـادەمی دروسـتکەردووە ، مرۆڤـی سـپی پێـست و ڕەش پێـست و سـور پێستی دروست کردووە بەڕادەیجیاوازی ڕەنگەکانی زەوی ، وە هـەروەها سەفەتەکانی مرۆڤیشی لە سیفەتەکانی زەوی دروست کردوە لـە مـستێك کـە خـوای گـەورە لـە هـەموو زەوی وەری گرتـووە .. لەبەرئـەوە ئـادەم ناونراوە بە ئادەم چونکە خـاکی زەویـە لـە (دیـم) ەوە هـاتووە بـە واتـای خـاك ، و ناونراوە ئـادەم ، بـۆ ئـەوەی کـاتێ پـەروەردگار بـاگـت دەکـات بـە (بنـی ادم) ئـەوەی ئـادەم ، تـا خـۆبـەکم زنـین و سـادەیی و بـۆ دەسـەلاّتیت بێنێتە وە یاد لە ئاسات مەزنی پەروەردگاردا ، چونکە تۆ دەزانیت ئادەم مانای چیيە و دەزانیت ئادەم لە چی دروست کراوە ..

وە یـەکم جـاری دروسـتکردنی ئـادەم –علیـە الـسلام– لـەخۆڵ تەمای سەرەتات بکە ، پاشـان خۆڵەکە تـەڕ بـوو – پـەروەردگار دەیتـوانی بە(کن فیکون)[1] یـك دروستی بکـات ، بـەلاّم بۆچـی ئـەمـە ڕوی نـەدا ؟ ئـەگـەر بـە (کـن فیکـون) یـك ئـادەم دروستبرکایە ئـەوە پلەبـەنـدی و لازازی مۆتـت نەدەناسی و وەنەت دەزانـی کـە چـەنـدە دروسـتکراوێکی لاوازیـت ، وە تـۆ هیچ نیت بێجگە لـە کـەمێ خـۆڵ نـەبێت . کـاتێ خۆڵەکـە تڕبـوو بووبـەقوڕ .. تەماشای پلەبەندی دروستکەدنەکە بکە.. پـەروەردگار دەفـەموێ ((إِذْ قَـالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّـي خَـالِقٌ بَـشَرًا مِـنْ طِـينٍ)) ص ) واتـە (( پـەروەردگارت بـە فریشتەکانی ووت : من دەمەوێت بەشەرێك لە قوڕ دروست بکـەم )) پاشـان قوڕەکە تەڕکراو بوو بە قوڕاوێکی حێگیر –واتە پێکـەوە لکـاو ، وە چـەنـدە

---

[1] واتە ( ببە دەبێت )

ئـاو بکرایـە بـە قوڕەکـەدا زیـاترو زیـاتر پەیوەسـت دەبووبەیەکـەوە ..
پەروەردگار دەفەموێ (( انا خلقناكم من طين لازب )) السافات – ١١ واتـە :
ئێمە ئێوەمان دروستکردووە لە قوڕێکی جێگیر

واتـە قـورێکی پێکـەوە لکـاوەی کـۆوە بـوو ، وە ئـەو قـوڕە پێکـەوە
لکاوە خـوای پەروەردگار بە دەسـتە پیرۆزەکـانی شـێوەکەی خولقانـدووە ،
لە شـێوە مرۆڤدا دروسـتی کـردووە ، کـێ شـێوەکەی خولقانـدوە . خـوای
پـەروەردگار((قَـالَ يَـاإِبْلِيسُ مَـا مَنَعَـكَ أَنْ تَـسْجُدَ لِمَـا خَلَقْـتُ بِيَـدَيَّ))
واتەپـەروەردگار فـەمووی : ئـەی ئیبلـیس چـی ڕێـت لێ دەگـرێ سـوجە
نەبەیت بـۆ دروسـتکراوێ کەبەدەسـتم دروسـتم کـردوە ))ص ٧٥ تـۆ خـۆڵ
بوویت و خۆڵەکە ترکراو بوو بە قوڕ قوڕەکەش تەڕکراو کۆکرایەوە بوو بە
قوڕێکی جێگیر . وە قـوڕە جێگیرەکـە ، بەدەسـتی پـەروەردگار شـێوەیەکی
لێ دروستکرا تا بوو بە قوڕێکی ڕەق وە ئەو قووڕ ڕەقە ، کاتـێ شـێوەی بـۆ
نەخـشێنرا لـە ئـەنجامی زۆری .. بـوو بـە قـوڕێکی ڕەق . لـە قـوڕێکی
ڕەشباوی ترشـاو –ڕەشـی تـەواو ڕەش – – پاشـان ئـەو قـوڕە ڕەقـە ی کـە
قوڕیێ:ی ڕەشیباوی ترشاوە بوو وازی لێ هێنرا تا وشك وویـەوەو بـوو بـە
قـوڕێکی ڕەق وەك فـەخفوری . ئەمـە قۆناعـەکانی دروسـتکردنی باوکـە
ئادەممان بوو لە خۆڵ ، پاشا ترکراو بوو بە قوڕ پاشان کۆکرایەوەو بـۆ
قوڕی جێگیر پاشان شێوەیەکی لێ دروسـتکراو بـوو قوڕی ڕەق ،وە واز لـە
قوڕەکە هێنرا تا بوو بـە قوڕێکی ڕەق لـە قوڕی ڕەشـباوی ترشـاو ،پاشـان
وازی لێ هێنرا تا ووشك بویـەوەو بوو بە قوڕێکی ڕەق وەکو فەخفوری .
وە خـوای گـەورە کونێکی لـە دەمـدا بـۆ کـردەوە ... وەکـو فـەخفوری ی لێ

هات .. هەتا ئەو كاتە گیانی بەبەردا نەكردبوو ، لەسەرچاوەكاندا هاتووە كە چل ڕۆژ وازی لیٚ هیٚنراوە .. پارچە فەخفوریەكە لەسەر شیٚوەی پەیكەریٚك, كاتیٚ ئەمە دەزانیت و بیردەكەیتەوە بۆت دەردەكەویٚ كە چەندە تۆ دروستكراویٚكی سادەیت ، چەندە تۆ لاوازیت ، وەچەندە پەروەردگار مەزن و بە توانایە .. پەروەردگار دەفەرمویٚ ( فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ) الحجر ٢٩ واتە : جاكاتیٚك ڕیٚك وپیٚك و تەواوم كرد ، لەو ڕۆحە تایبەتەی كە من ( بەدیهیٚنەریمی ، پیٚم بەخشی ، ئەوە هەمووتان كڕنووشی بۆ بەرن (كڕنووشی ڕیٚز بەفەرمانی خوا)

پەروەردگار یەك فوی كرد بەو قوڕە ڕەقە داو بوو بە مرۆڤیٚك كە ببیستیٚ و فامی هەبیٚ ببینیٚ و تیٚبگات ، وە سەرو ناوسك و جەگرو دەستی هەبیٚت بجولیٚن ، هەموو ئەمانە بەچی ؟ بە فوویەك لە خوای پەروەردگارەوە .. ((فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ)) پیٚش كەمیٚك فەخفوری یەك بوو ، بەلاٚم ئیٚستا بوو بە مرۆڤیٚك دەبیستیٚ و دەبینیٚ ، وەخوای پەروەردگار فەرمانیدا بە فریشتەكان سوجدەی بۆبەرن ..

براو خوشكانم چ سوودیٚك لەم بەسەر هاتەوە وەردەگرین .. سودی ئەوەی لیٚ وەردەگرین كە ئیٚمە بیٚ دەسەلاٚت و لاوازین .. ئەمە بەسەرهاتی دروستبوونی تۆیە .. چەند ئایەت دەربارەی دروستكردنی مرۆڤ و تواو دەسەلاٚتیخوا بدویٚت ، بۆ ئەوەیە كە تۆ بیر بكەیتەوە و بیر بكەیتەوە ، تەماشاكە ئەم ئایەتە چی دەفەرمویٚ((سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ.. )) فصلت ٥٣) واتە : ئیٚمە لەئایندەدا بەلگەو نیشانەی سەرسوڕهیٚنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆكانی

بوونەوەرەداو لە خودی خۆشیاندا ، تا بۆیان ڕوون بێتەوە کە ئەو زاتە هەق و ڕەوایە )) ئەم ووتانە ئامانج لێ ی ئەوەیە کە بیر بکەیتەوە چۆن ئادەم دروست بوو ، وە چۆن کاتێك ئەو بریتی بوو لە پەیکەرێك لە فەخفەری بە فوویەك لە خوای پەروەردگارەوە بوو بەئادەم ، دەی فێر ببە کەملکەچی پەروەردا ببیت وە بزانە کە تۆ کێیت و ئەسل و ئەسەبت کێ یە . لێرەدا ئامارژە بە شتێك دەکەین ، مرۆڤ لە دوو شت پێکهاتووە : لە خۆڵو لە فوویەکی مەزن لە پەروەردگارەوە ، وە ك ئەوەی دوو کار هەیە کە پێویستە زۆر بەباشی فیری ببیت .. ئەویش ئەوەیە کە ئەسڵی تۆ لەخۆڵە ، ئەگەر پەیوەست بیت بە خوای پەروەردگارەوە ئەوە ڕێزت لێ گیراوە ئەو فووە بەرز و بڵندی کردوویت لەبەر ئەوە دەبینیت کە زانایانی ڕۆژئاوا سەرسام ماون لە نێوان دووجۆر مرۆڤ ،جۆری یەکەم دەڵێن : مرۆڤ ئاژەڵە و پیسەو رقی ای‌یەتی , ڕقی لە ڕەگەزی مرۆڤە . وە هەندێکی تر شانازی بە ڕەگەزی مرۆڤایەتیەوە دەکەن ، بەڵام ئێمە دەڵێین ئەسڵی مرۆڤ لە گڵەوەیە ئەسڵی تۆ نوتفەیەکی بێزراو بوو , بەڵام خوای پەروەردگار فووی پێدا کردیت و بەدەستی خۆی تۆی سازاند ، بۆئەوەی تۆ ڕازی و ڕێزداربیت تیایدا ، وە نابێ بووتری 'مرۆڤ ئاژەڵێکی قیزەونە ، بەڵکوو ڕێزی لێ گیراوە بەفوی خوای پەروەردگار ، وە پەروەردگار باوکمانی بەدەستی خۆی دروست کردووەو فەرمانی بە فریشتەکان داوە سوجدەی بۆ بەرن ئەمە بەشێك ، بەڵام بەشەکەی تر ئەوەیە کە مرۆڤ لاوازە لە خاکەوەیە و تەڕکراوە و بووە بە قوڕ ، پاشان شێوە کراوە و بووە بە قوڕێکی ڕەق ، وە ئەو قوڕە ڕەقە ش وازی لێ هێنراوە تا ووشك بووەتەوەو بووە بە فەخفوری ئەگەر فووی خوا نەبوایە ئەوە پەیکەرێکی بێ بەهاو نرخ دەبوو .

## تۆ چۆن خوای گەورە دروستی کردیت

پەروەردگار دەفەرموێ ((هَلْ أَتَى عَلَى الإِنسَانِ حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُنْ شَيْئًا مَذْكُورًا)) الانسان /

واتە (( بە ڕاستی ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگار بەسەر ئادەمیزادا هات کە شتێکی وا نەبوو ناو ببرێت )) تەماشای ئەم پرسیارە قورئانیە بکە ، ئایا تۆ ڕۆژێك هەبووە ئەی ئەوەی ئادەم کە هیچ نەبوبیت ؟ پرسیارەکە ئاسانە و وەڵامەکەشی ئاشکرایە ، بەڵێ سەردەمانێك هەبوو کە مرۆڤ هیچ شتێکی باسکراو نە بووە ، بەڵام بۆچی پەروەردگار ئەم پرسیارەمان لێ دەکات ؟ ئەو پرسیارەمان لێ دەکات تا بیر بکەینەوە ، ئایا بەهای بیر کردنەوە دەزانن .. وە بەهای ئەم پەرستشە .. تۆ بیر بکەرەوە ئایا ڕۆژێك هەبووە کە تۆ هیچ نەبووبیت تەنانەت ئەتۆمێکیش نەبووبیت ... بەڵام ئایا ڕۆژانێك بووە کە باوکت هیچ نەبووبێت ... !! وە ئایا باپیرە گەورەت پێش ملیۆنەها ساڵ هیچ نەبووبێت ، ئەی تۆ چیت تا خۆت بەگەورە بزانیت بەسەر خوای پەروەردگارەوە .. وە تۆ چیت بالاْ پۆشی ڕەت بکەیتەوە .. وە تۆ چیت تا نوێژ کردن لە مزگەوتا ڕەت بکەیتە ,, وە ئایا بیرت چوو کە ڕۆژێك بوو وە ڕۆژێك دا دێت کە هیچ نەبوویت و هیچ نابێت لەم بوونەوەرەدا ((هَلْ أَتَى عَلَى الإِنسَانِ حِينٌ)) ڕابمێنە لە وشەی (حین) نە ڕۆژێکە یان دوو ڕۆژ .. ((حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ)) نەیفەرمووە : ساتێك لە ڕوژەکان بەڵکو ساتێ لەسەردەم .. ئەی ئەوەی ساتێك لە ڕۆژگارو سەردەم هاتووە بەسەرتا تۆ هیچ پشکێکت لە بووندا نەبوو ، کێ تۆی هێنایە بوون : کێ

تۆی هێنایە ئەم گەردوونە ؟ ئایا ئەوەی تۆی هێنایە بوون دەپەرسترێ یان سەرپێچی لێ دەكرێ ؟

سەرەتای تۆ تۆمێك بوو .. ڕابمێنە لە ڕوخسارت و جەستەت ؟ تەماشای خۆت بكەو تەماشای بیستنت و بینینت و بیر كردنەوەت بكە .. تۆ ئەی ئەو كەسەی لەزەت لەو هەموو شتانە دەبینیت ، ئەمە ئەسڵی تۆیە ؟ ئەسڵی تۆ تۆمێك بوو ((أَوَلَمْ يَرَ الإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِنْ نُطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُبِينٌ)) يس ٧٧ / واتە ( ئایا ئادەمیزاد سەرنجی داوە كە : ئێمە بێگومان دروستمان كردووە لە تۆمێك كەچی خێرا بووەتە دوژمنێكی ئاشكراو دژایەتیمان دەكات))

((وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِ الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ(٧٨)قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ)) يس /٧٨-٧٩ واتەنموونەی لاواز و بێ دەسەلاتی بۆ ئێمە هێناوەتەوەو بە دیهاتنی خۆی لەبیر كردووە ، دەیوت : كێ ئەم ئێسكانە زیندوو دەكاتەوە لە كاتێكدا كە ڕزیوو پتوركاون (٧٨) پێیان بڵێ : ئەو زاتەی كە یەكەم جار دروستی كرد هەر ئەویش دروستی دەكاتەوە ئەو بەهەموو دروستكراوێك زاناوبە ئاگایە )) پەروەردگار دەفەموێ ((قُتِلَ الإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ(١٧)مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ(١٨)مِنْ نُطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ)) عبس ١٧-١٩) واتە : بەكوشت چێت ئادەمیزاد چی وای لێ كردووە كە كافر بێت (١٧) خوا لەچی دروستی كردووە (١٨) لە نوتفەیەك دروستی كردووە و ئەندازەگیی لە دروستكدنیدا ئەنجام داوە (١٩) هەموو شتێك لە ئامێرەكەتدا بە ئەندازەگیریە ، وە هەموو شتێك لە بونیاتدا ئەندازەگیریە ، با لەسەرەتای

نوتفەوە دەست پێ بکەین .. وە من کاتێ دەدوێم دەمەوێ وێنای لاوازی خۆت بکەیت .. گوێ لە زانایان بگرە بزانەچی دەڵێن ، کەمێك لەمەڕ زانست دەدوێین بۆ زیاتر ترسان لە خوای پەروەردگار ، و زیاتر بینینی مەزنی پەروەردگار

زانایان دەڵێن : یەك نوتفە کە سانتیمەترێك سێجایە لە نێوان هەشتا تا سەد ملیۆن گیانداری سپێرمیە . وە ژمارەی ئەو نوتفانەی پیاو فڕێی دەدا دەگاتە نزیکەی سێ تا چوار سانتیمەتر سێجا ، ئەمەش مانەی ئەوەیە کە ژمارەی گیاندارە سپێرمیەکان لە پیاودا دەگاتە نزیکەی پێنج سەد ملیۆن گیاندار ، وە کاتێك لە پیاوەوە فڕێ دەدرێت بەرەو ئاراستەی منداڵدان دەڕوات . کێ ڕێ ی نیشاندا .. کارێکی زۆر سەیرە .. کێ ڕێ ی نیشانی ئەو گیاندارە سپێرمانە دا بەو تاریکیانەی ناو سکی دایك و ئافرەتدا بە ئاڕاستەی خۆیدا بڕوات ، ئەو دەزانێ بۆ کوێ ئەچێ ، پێنج سەد ملیۆن گیانداری‌سپێرم بە ئاڕاستەی منداڵدا ندا دەچن زۆر بەی ئەو گیاندارە سپێرمانە دەمرن و تەنها پێنج سەدیان لەو پێنج سەد ملیۆنە توانای ڕۆیشتنە منداڵدانیان هەیە ، وە کاتێك ئەو پێنج سەدە دەیانەوێ گەراداان بڕن کە بەرگەپۆش کراوە بە ڕووپۆشێکی ئەستور,بەر لە هەموو شتێ دەگرێ کەپێ ی بگات ، وە پێنج سەد گیاندار هەوڵ دەدەن ، وە هەریەکەیان مادەیەکی شل دەردەدەن کە ئەو ڕووپۆشە دەتوێنێتەوە تایەك گیانداری سپێرمی دەوانێت ئەو گەرایە لەت بکات ، وە ئەو تەنها گیاندارە یەکێك بوو لەو پێنج سەدە کە لەسەرەتادا پێنج سەد ملیۆن بوون .. کێ سازێنەرە ؟ وە ئایا عەقڵ دەیبڕێنەم بڕە یاسایە بەڕێکەوت بێت ؟ بیر

بکەرەوە لە ئەسڵی خۆت کە چی بوویت ؟ پەروەردگار دەفەرموێ ((قَالَ فَمَنْ رَبُّكُمَا يَامُوسَى(٤٩)قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى)) گە /٤٩–٥٠ واتە:فیرعەون بەفیزەوە ووتی:باشەئەیموسا پەروردگاری ئێوە کێیە؟موسا ووتی پەروردگارمان ئەو زاتەیە کەهەموو شتێکی بە ڕێکوپێکی درووست کردووە,پاشان ڕێنموویی‌کردووە تابەچاکی دەوری خۆی ببینێت ولەخزمەتی ئادەمیزادابێت...گیانداری سپێرمی دروست دەکات و ڕێنوومایی دەکات بەڕێگاو ئاراستەی خۆیدا تا دەگاتە گەرا ((وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالأُنْثَى(٤٥)مِنْ نُطْفَةٍ إِذَا تُمْنَى)) )) النجم /٤٥–٤٦ .. نوتفە یەك لە سپێرم نێرومێی لی دەردێت.. ماناى ئایەتەکە (( هەر ئەو زاتەش دوو جۆری دروستکردووە کە نێرومێیە (٤٥) لە نوتفەیەك کاتێ لە جێی خۆیدا دادەنرێ ))

ئایا ڕۆژێك بیرت کردۆتەوە لەمەو یادی ئەسڵی خۆت کردۆتەوە .. ئەصڵی تۆ چی‌یە ! ئەی ئەو کەسەی ئەسڵت نوتفەیەك بوو . زانایان دەڵێن : گیاندارە سپێرمەکە دوای ئەوەی دەڕواتە ناو گەراکە وە دەتوێتەوە و تێکەڵ دەبێت لەگەڵ گەراداو لەشی لەگەڵ لەشی ئەودا یەك دەگرێت تاوەکو نوتفەی تێکەڵ پێك بێت لە هەردووکیان– ناوی پیاوو ناوی ئافرەت – وە گوێ لە ئایەتی پەروەردگار بگرە ((إِنَّا خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ...)) امشاج بەماناى ((تێکەڵاو)) دێت، کێ پێغەمبەر –ص– ی ئاگادار کرد کەچی ڕوو دەدات لە نێوان گیانداری سپێرمی و گەرادا . ((إِنَّا خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا)) الانسان /٢ واتە (( بێ گومان ئێمە مرۆڤمان دروستکرد لە نوتفەیەکی تێکەڵە

لەسەرەمێکوتەیەکی بچوك و هێلکۆکەیەك ) دەمانەوێ تاقی بکەینەوە هەر بۆیە دەزگای بیستن و بینینمان پێ بەخشی ))

دواتر گوێت لێ ئەبێت و دەبینیت کێ بڕوا بەمە دەکات ؟ ئەگەر موعجیزەی لە دایك بونی مرۆڤ هەموو ڕۆژێ لە نەخۆشخانەکان و ماڵەکاندا ڕووی نەئەیاو یەکێك بهاتیە و ئەم هەواڵەی پێ بدایتایە ئایا بڕوات پێ دەکرد .. ئەگەر یەکێ پێی بوتیتایە بەم شێوەیە ئادەمیزاد دروست دەبێت و بەلاَم تۆ نازانیت ، ئەوە دەت ووت ئەمە قسەیەکی سەیرە .. سەرەتایی تۆ بەم شێوەیە بووە.

تەنها بە داخڵ بوونی گیانداری سپێرم بۆ گەرا یەکالاَ ئەبێتەوە، پێغەمبەر –ص– دەفەموێ (( ما من كل الماء يكون الولد )) [1] واتە (( لە هەموو ئاوێك منداڵ دروست نابێت )) عەرەبەکان وا گومانیان دەبرد کە لە نوتفەیەك پیاوێك دروست دەبێت .. پێغەمبەر –ص– هەواڵی ئەوەمان پێ دەدات کە لەو پێنج سەد ملیۆنە تەنها پێنج سەدو لەو پێنج سەدەش تنها گیاندارێکی سپێرم دەمێنێتەوە بە زیندوویی ، ئەوە ئەمەمان فێر دەکات و دەفەموێ (( ما من كل الماء يكون الولد )) وە ئەم فەرمودەیە موسلیم گێڕاویەتیەوە ..

((وَمَا يَنطِقُ عَنْ الْهَوَى(٣)إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى)) النجم /٣–٤ واتە (( قسەو گوفتاریشی (ئەوەی کە قورئانە ) لە ئارەزووی و هەواو هەوەسەوە نیە (٣) ئەمەی کە ڕای دەگەینێت تەنها نیگا و وەحی خواییە ))

---

[1] اخرجه مسلم ( ١٤٣٨) و احمد ( ١١٣٦٨) عن ابی سعید الخدری –ر.ض –

دەمەوێ تەنها لە ڕوانگەی زانستەوە نەزانیت ، بەڵکو لە ڕوانگەی مەزنی پەروەردگارەوە . ئێستە دوای ئەوەی گیانداره سپێرمە کە تێکەڵ بوو لەگەڵ گەرا کەدا لەناو منالْداندا .. ئەی منالْدان چییە ؟

تەماشا بکە چۆن خوای پەروەردگار منالْدانی پاراستوە منالْدان ئەو جێگایەیە کە پەروەردگار هەڵیبژاردووە تا تۆی تیادا دروست ببیت ، وە ئەم جێگایە دەورە دراوە بە ئێسکی حەوزەوە لە ئافرەتدا .وە ئێسکی حەوز دەورەی منالْدنی داوە ، وە لە هەموو لایەکەوە دەورەی داوە نەك تەنها ئێسکی حەوز بەڵکو ماسولکەکان لە هەموو لایەکەوە حەوزیان بەستوەتەوە ، ماسولکەبەند لە هەموو لایەکەوە منالْدانیان بەستوە تەوە تاوەکو بەتەواوی پارێزگاریی بکەن ، وە بەهۆی ئەم ماسولکە کۆبەندانەوە حەوزی منالْدان پارێزراو دەبێت ، تا ئەو ڕادەیەی پزیشکەکان دەڵێن ئەگەر یەکێك بیەوێت ئافرەتێك بکوژێت و بە چەقۆ هەڵیدرێت ناتوانێت بگاتە منالْدانی ئافرەتەکە ، وە ئەگەر ئافرەتێك لە بەرزاییەکەوە بکەوێتە خوارەوە و ئێسکەکانی بشکێت ئەوە منالْدانی بێ زیان و پارێزراو دەبێت ، گوێ لە پەروەردگار بگە (وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِنْ سُلاَلَةٍ مِنْ طِينٍ(١٢)ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ)) المؤمنون /١٢-١٣ واتە : (( سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان لە ئاوێتەیەکی پێکهاتوو لە قوڕ بەدیهێناوە (١٢) لەوەو دوا لە جێگەیەکی پارێزراوو لە باردا (لە منالْداندا) لە شێوەی نوتفەیەکی زۆر بچوکدا دامان مەزراندووە ( قرار مكين) : منالْدانە. پەروەردگار دەفەرموێ ((أَلَمْ نَخْلُقكُمْ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ(٢٠)فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَكِينٍ (٢١) الى قدر معلوم (٢٢) فقدرنا فنعم القادرون )) المرسلات /٢٠-

۲۲ واتە ((ئایا ئێوەمان لە ئاوێکی بێ نرخ دروست نەکردووە ( ۲۰) ئینجا لـەجێ ی چەسـپان و مەحکەمـدا نوتفـەمان دانـاوە (۲۱) بۆماوەیـەکی دیـاریکراو(۲۲) ئینجـا ئێمـە دەسـەلاّتدار بـووین بەسـەر ئەوانـدا ، ئـای چ دەسـەلاّتدارێکی چاکین).. ئـەی ئـەو کەسـەی نوتفەیـەك بوویـت ، ئـەی ئـەو کەسەی پارێزرایت لـە منالّدانـدا ، ئایـا دەوێریـت بـە پـەروەدار ؟ اکـی تـۆی پاراسـت ؟! .. ئـەی دایـك بـە تواناکانـت یـان بـە لێهاتوویـەکانت ئـەو لـە دایکبووەت پاراست ، وە دەردەکەوێ هیچ نازانیـت لـەو بارەوە ، ئافرەتی وا هەیە شەش جارو حەوت جار منداڵیان دەبێت هیچ نازانن ئەوە نەبێ کە منداڵیان دەبێ ، بەلاّم کێ پارێزەرە و کێ ئەو کۆرپەیەی پەروەدەکردووە لە سکی تۆدا ، کێ پارساتی لە منالّداندا .

تۆ ئێستا هێشتا نوتفـەیت لـەناو منالّدانـدا بـەلاّم دەورە دراویـت بەسـێ شت ، دەورە دراویـت بـە پەردەیـەك لـە نـاو منالّـدان وەکـو کـیس – المشیمە – پاشان دەورە دراویت بە منالّدان پاشان دەورە دراویت بە سکی دایك .. تەماشاکە چۆن پەروەردگار دەفەرموێ ((يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُـونِ أُمَّهَـاتِكُمْ خَلْقًا مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلاَثٍ ذَلِكُمْ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْـكُ)) الزمـر /٦ واتـە (( لە وەودوا لە سکی دایکاندا ئێوە دروست دەکات بە چەند قۆناغێك ، لـە ناو سێ تاریکاییدا مەبەست سێ پێسەکەسە کە کۆرپەلەی تێدا حەشار دراوە ) ئـا ئـەوە خوایـە ، ئائەوەیـە پـەروردگارت خـاوەنی هـەموو بەدیهێنراوەکانە )) دوای ئەوەی ئەم ئایەتـەت خوێنـدەوە ئێستە تەماشای ئەو هێزە بکە ، بیهێنە خەیاڵت ئافرەتێك هە یە و لـەناو سـکیدا نوتفەیـەك هەیە . وە ئەو نوتفە یە پارێزراوە بی سێ تاریکایی وە دوای دە یان بیست

ساڵ دێت بۆ مزگەوت و گوێ ی لەم قسانە دەبێت ، وە تۆ پێش دەساڵ یان بیست ساڵ بەو شێوەیە بوویت . چەندە لاواز و بێ دەسەڵاتیت ! چۆن زاتت كرد بەرامبەر پەروەردگارت؟ چۆن بە پەروەردگارت ووت : نا ؟ وە چۆن دوای ئەمە زات دەكەیت بڵێت : قەناعەتم پێ بكەن من بەگوێی فەرمانەكانی خواناكەم تا یەكەم جار قەناعەتم پێ نەكەن، تۆ پێشتر چی بوویت ؟ تۆ نوتفەیەك بوویت .. وە چۆن دوای ئەمە لاوێك دێت و دەڵێ : من ناتوانم واز لە فلان گوناه بێنم ، داوای لێبورد دەكەم ، من قەناعەتم هەیە بەڵام ناتوانم وازی لێ بێنم.. تۆ چیت و كێیت تا بە خوای پەروەردار بڵێیت : نا ، تەماشای قەبارەی خۆت بكە و تەماشای سەرەتای خۆت بكەو تەماشای دروست بونی خۆت بكە ، گەورەیی پەروەرداری خۆت بزانە .

لەوانەیە كاتێ ئەم ووتانە دەخوێنیتەوە دڵت شەحن بێتەوە بە دەسەڵات و مەزنی پەروەردگار ، وە هەست بەمەزنی پەروەردگار بكەیت باشتر لەوەی گوێت لە بیست وانە بگراتایە دەربارەی ڕەوشت و عیبادەتەكان ، وە ئەم ووتانە دەبنە هۆی ئاڕاستەكردنت لەسەر ڕەوشت و عیبادەت دوای ئەوەی مەزنی پەروەردگارت بۆ ئاشكاربوو ((ذالكم اللة ربكم لة الملك لاالةالا هو فانى تصرفون *إِنْ تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْكُمْ وَلاَ يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِنْ تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ.. )) الزمر (٦-٧ ) واتە : (( ئا ئەوە یە پەروەردگاتان خاوەنی هەموو بەدیهێراوەكانە، جەگە لەو خوایەكی تر نیە ، جا ئیتر بۆ كوێ‌لا دەدرێن لە خوا پەرستی (٦) ئەگەر خۆتان بێ باوەڕ بكەن ، بێگومان خوا بێ نیازە لێتان، هەرچەندە ڕازیی نابێت كە بەندەكانی بێ باوەڕبن و ڕێبازی خوانەناسی بگرن ، ئەگەر سوپاسگوزاری بكەن بەو كارەتان ڕازی

دەبێت )) ئایا سوپاسگوزاری دەبیت یان کوفرانە بڕێری دەبیت دوای ئەوەی لەناو سێ تارکاییدا دروستی کردیت.. با ڕابمێنین چۆن گەشەت کرد لە سکی دایکتدا ، چۆن نوتفە ی سپی گۆڕا بۆ کۆمایەك خوێنی سور کە پێیدەوتری خانەی هەڵواسراو ( علقە) بۆچی ناونراوە بە و ناوەوە ، چونکە پەیوەستدارە بە دیواری منداڵدانەوە ، زانستی پزیشکی نوێ باسی ئەمەی کردووە .. بەلآم سەیر لەوەدایە ئێمەی‌گرۆی موسڵمان چواردە سەدەیە ئەمە دەزانین... پەوەردگار دەفەموێ اقْـرَأْ بِاسْـمِ رَبِّـكَ الَّـذِي خَلَقَ(١)خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ(٢)اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ)) العلق /١-٢ واتە : ( ئەی محمد بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردەوە (١) ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو دروست کردووە )) تەماشای ووردەکاریی ووشەی (علق) بکە .. کێ پێغەمبەری خوای – ص– فێر کرد کە ئەو کۆمەڵە خوێنە کە پەیوەستە بە دیواری منداڵدانەوە ناوی (علق) ە..

تۆ ئەی (علقة).. خواردن وخۆراکی تۆ چیە .. خوێن! خوێنی هاتوو لە بۆریە خوێنەکان بۆ منداڵدان. ئایا درێژی (علقة ) چەندە ؟ درێژیەکی لە نێوانان ٢,٥-٤ ملیمە .. تۆ دوو ملیم بوویت وە ناتەوێ گوێ لە فەرمایشتی پەوەر بگریت . مرۆ شەرم دادەگرێ کاتێ لبر لە گوناهەکانی دەکاتوە .. کاتێ کە پەبارەکەی تێپەر نەدەکرلە ٢-٤ دوای تێپەڕاندنی بیست پێنج ڕۆژ لە منال<انی دیکدا ((اقْرَأْ بِاسْـمِ رَبِّـكَ الَّـذِي خَلَـقَ(١)خَلَـقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ(٢)اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْـرَمُ)) العلـق /١-٣ (علقـة) کە دەگۆڕێت و گۆشت پارە (مضغة ) .. وە هۆی ناو نانی بە (مچغە) ئەوەیە چونکی کاتێ

بە وورد بین تەشای دەکرێت وەکو پارچە گۆشتێکی جوراو وایە ، وەکو بنێشتێك وایە کە بەدان جویبێتمان ، تۆ کایێ خۆی ئاوا بوویت ، تەماشی ووردەکایی دە بڕینی قورئا بکە کاتێ دەفەرموێ (مضغة) .. سبحان الله .. وە بۆچی گۆشت پارە ! چونکە ئەو پارچە گۆشتە وورەدە ووردە بەش دەبێ بۆیە جووراوە چونکی پارچەی سەرەوەی لە شوێنی سەردایە ، وە جووراوە چونکە ئو شوێنی ئێسکی تێدایە ، وە جووراوە چونکە ئەو شوێنە دەستی یوە یەتەمەر ، بیهێنە خەیاڵی خۆت .. سبحان الله ! نامەوی چاو بپۆشم و نامەیێ باڵا پۆش بم !

پەوەردگار دەفەرموێ (( .. الا له الخلق والامر )) الاعراف : ٥٤ واتە (( ئاگاداربن و تێبفکرێن هەرچی دروستکردن و بڕایردانە هەر بۆ ئەوە )) ئەوەی مرۆڤ دروست دەکات ئەویش فرمان دەدات..

ئەی گۆشت پارە ، درێژی تۆ بوو بەچەند دوای ئەم ماوەیە ، درێژیت لە ٨ملم تێپەڕی نەکر ، کاتێ کەمێك گۆشت پارە گەورە دەبێت دەبێتە شانزە ملم ، پاشان دابەش بوون دەست پێدەکات ، وە دابەش بوونەکان دەردەکەون بەڵام ئادکارەکانیان ئاشکار نیە .. سبحان الله .

(( ولقد خلقناکم ثم صورناکم )) الاعراف/١١ .. واتە بەڕاستی ئێمە ئێوەمان دروستکردووە پاشان ڕواڵەت و ڕوخساری ئێوەمان کێشاوە )) پەروەردگار دەفەموێ (( یا ایها الانسان ما غرك بربك اکریم (٦) الذی خلقك فسواك فعدلك (٧) فی ای صورة ما شاء رکبك (٨) )) الانفطار (٦-٨) واتە (( ئەی ئینسان ، تۆ تۆ چی وای لێکردیت کە سەرکەش بیت بەرامبەر پەروەردگاری میهرەبانت (٦) ئەو پەروەردگارە تۆی دروستکردووە و

پاشان سازاندویتی و ڕێك وپێکی کردویت (٧) لەهەر شێوەو شێوازێکدا وویستویەتی تۆی ڕێك خستووە و ئەندمەکانتی بەیەکەوە لکاندووە پەوەردگار دەفەرموی (( لم كان علقة فخلق فسوى )) القيامة /٣٨واتە (( پاشان خۆ هەڵواسرێك بوو گەشەی کردوو ڕۆح و دەزگاکانی دەرەوە و ناوەوەی بە ڕێك و پێکی پێبەخشی )) چەندین پزیشك بەهۆی ئەم ئایەتەوە موسڵمان بوون .. چونکە خوای پەوەردگار دەفەرمویٚ ( لَمَ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ )) ئایا کیٚ ( علقه ) بوو دروستکراو بوو یان دروستکردن دوای (علقة ) دەستی پێکرد ، چالاکی پێکهاتنی مرۆڤ بە (مضغة) دەستی پیٚ دەکات دوای (علقه ) تێبینی ووردەکاریی ئایەتە قورئانیەکە بکە ( كان علقة فخلق )) کاتیٚ کە ( مضغة )یە ئادکاری پێکهاتەو شێوی دەردەکەویٚ . زانایان دەڵێن : دوای تەواو بوونی هەفتەی شەشەم قەبارەی (مضغة) گۆشت پارە دەگاتە (١٦) ملیمەتر ، وە دوای هەفتەی شەشەم ئێسکە پەیکەر دەست بە پێکهاتن دەکات . وە پێکهاتنەکەی کەوانەیی دەبێت لە شێوەی مانگدا ، دوای ئەوە وردە وردە مانگەکە ڕێك دەبێتەوە .. ((يَاأَيُّهَا الإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ(٦)الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ)) تۆ پێشتر کەوانەیی بوویت و نەت دەتوانی ڕێك بیتەوە ، شێوەت لە ئاژەڵانی دەکرد ، کیٚ تۆی ڕاستکردەوە کاتیٚ کە لە سکی دایکتدا بوویت ؟ خوای پەروەردگاربوو ..

لەگەڵ سەرەتای هەفتەی هەشتەمدا ماسولکەکان دەست بە دەرکەوت دەکەن ، ئێسکەپەیکەر و ئێسکە بچوکەکان بە گۆشتێکی نەرم و ناسك دەورە دەدرێن .. پەوەردگار دەفەمویٚ (( .. فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا

الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا... )) المو منون/١٤ واتە (( پاشان خۆهەڵواسراوەکەمان کردووە بە گۆشتپارەیەك ، ئینجا گۆشتپارەکەمان بە پەیکەری ئێسك گۆڕیوەو بە گۆشت پەیکەری ئێسکەکەمان داپۆشیوە ..))

کێ گۆشتی پۆشی بە ئێسکەکەدا . وە دوای ئەوە گۆشت پارە لە شێوی مرۆڤ دا بسازێنرێت ، ئایا بیرتان دێت چۆن ئادەم دروست بوو ( خوای گەرە بە دەستی خۆی دروستی کرد )) وەك ئەوەی هەمان پلەبەندیی لێرەشدا دووبارە بێتەوە .. تۆ وەك باوکت وایت ، گۆشت پارە گۆڕانی بەسەردا دێت و دەبێتە شێوی مرۆڤێك .. پەروەردگار دەفەرموێ (( ثم انشاناه خَلقاً اخَر )) مو ٔمنون/١٤ واتە : (( ئەوسا لە شێوەیەکی تردا دەرمان هێناوە و سازاندومانە))

دوای ئەوی گۆشت پارەیەکی بێزلێکراو بوو ، پاشان ئەو گۆشتپارەیە دەگۆڕێت بۆ شێوەی مرۆڤێك لە ناو منالْداندا ، وە گەشەی دڵ بەتەواوی دەست پێدەکات ، پاشان کۆ ئەندامەکانی لە ش هەڵدەستن بە ئەرکەکانیان ..

لەگەڵ سەرتای هەفتەی یانزەهەمدا گۆپکەی ددانەکان ووردە ووردە دروست دەبن، ڕابمێنە لە لاوازیی خۆت ئەی ئادەمیزاد ، بیهێنەرە خەیاڵی خۆت کاتێ بەو شێوەیە بوویت و پەلەکانت بجولێنە و لەخۆت بپرسە کێ وای لێکردیت بەو شێوەیە بجولێیتەوە ؟ کێ وای لێکردیت ببینیت ، تۆ سازێنراوی کێیت ؟ تۆ موڵکی کێیت ؟ براو خوشکان ئەم ڕاستەقینەیە لە یاد دەچێتەوە ، لەبەرئەوە ئێمەش لە پەروەردگارمان دوور دەکەوینەوە , بۆیە پێویستە هەمیشە ئەوەت لە یاد بێت کە تۆ بەندەیت و

مـوڵکی خـوا و سـازێنراوی خـوای پـەروەردگاریت ، تـۆ پێویـستت بـەخوا هەیە و بەبێ خوای پەروەردگار هیچ ئەرزشێك ناهێنیت .

وە لەگـەڵ سـەرەتای هەفتـەی دوانزەهەمـدا قـەبارەی مـۆخ زیـاد دەکات و گەورە دەبێت تا قەبارەی سەر دەگاتە نیوەی قەبارەی لـەش ، وە لەسـەرەتای هەفتـەی هەژدەهەمـدا شـتێکی سـەیر ڕوو دەدات, بۆشـایی لسەردا دروست دەبێت ، چاڵ لەسەردا ، پەورەردگار دەفـەرموێ ((وَنُقِرُّ فِي الأَرْحَامِ مَـا نَـشَاءُ إِلَـى أَجَـلٍ مُـسَمًّى)) الحـج /٥ واتـە (( ئـەوەش بمانـەوێت لـە منداڵدانەکاندا جێگیری دەکەین ، تاکاتێکی دیاریکراو))

چل هەفتە .. دوای چل هەفتەمنداڵدان بەندەیەك لە بەندەکانی خـوا فـڕێ دەداتـە دەرەوە . پاشـان تەماشـای شـتێکی لـەوە سـەیرتر بکـە ، کـێ کۆرپـەی فێـری ئـەوە کـرد کـە لـە کۆتـایی یـان سـەرەتای هەفتـەی سێهەمدا لـەناو منـاڵدانـدا خـۆی هەڵگێڕێتـەوە وە کەللـەی سـەری نزیـك لـە دەروازەی منالدان بکاتەوە _سبحان الله – دەماخی بۆ خـوارەوە ، وە کـاتێ تەماشـای ئەو وێنە یە دەکـەیت – وێنـەی کۆرپەلـە –سـەرت سـوڕ دەمێنـێ ، کۆرپەلـە ڕاستەوخۆ پێش لەدایك بوون قاچی کۆ دەکاتەوە بە ئاراسـتەی سـکی ، وە هەردوو دەستی و سەری بەرەو سـنگی دەبـات تـا دەرهـاتنی ئـاسان بێـت _ سبحان الله – پەروەردگار دەفـەرموێ (( والذی قدر فهدی )) الاعلی /٣ واتـە (٠ ئەو زاتەی کە نەخشەی کێشاوە بۆ هەموو شتێك و جاڕێنمویی کـردووە ((

کـێ ڕێنمـایی کۆرپەلـەی کـرد کـە هـیچ نازانێـت و بـە شێوە سـەیرە خۆی بسازێنێ ، تۆ کاتێ تەماشای ئەو وێنەیە دەکەیت لە هـەر کتێبێکـی

زانستیدا بێت سەرت سوڕدەمێنێ ! كۆرپەلە خۆی خۆی هەڵگێڕێتەوە وە سەری نزیك دەروازەی منداڵدان دەكاتەوە و هەردوو قاچی كۆدەكاوە ، وە لە بری ئەوەی سەری بەرز بێت دای دەنەوێنێ بەرەو سنگ.. خوای پەروەردگار دەفەموێ (( .. صنع الله الذي اتقن كُل شيء )) النمل /٨٨ واتە ( ئەمەیە دەستكردی ئەو خوایەی كە هەموو شتێكی بەرپەری ڕێكوپێكی دروستكردوە )) وە سەرسامتر لەوە كۆرپەلە لە دوو مانگی كۆتاییدا پەنجە دەخاتە دەمیەوە و دەیمژێـە ئەمەش بۆ ئامادەباشی بۆ شیر خواردن كاتێ لە سكی دایكی دێتە دەر ، كێ فێری ئەمەی كرد ، وە كێیە ئەو میهرەبانەی بەو شێوەیە ئەو هەموو میهرەبانی و بەزەییە دەنوێنێ بەرامبەرمان..

پاشان شتێكی سەرسامتر دەبینیت كۆرپەلە دوای ئەوەی گوێكانی و چاوەكانی دروست دەبن ، چاوەكانی بە نووقاوی دەمێننەوە ، چونكە ئەگەر چاوەكی بكاتەوە بەهۆی خوێن و پەردەو ئەنزیماتی ناو منداڵدای دایكەوە تۆڕی چاوی لەناو دەچێت ، كێ فێری ئەوەی كرد كە چاوەكانی بنوقێنێ چونكە ئەگەر بیانكاتەوە كوێر دەبێ ! پاكو بێگەری بۆ سازێنەر پاك وبێگەری بۆ دروستكەر ((خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ هَلْ مِنْ شُرَكَائِكُمْ مَنْ يَفْعَلُ مِنْ ذَلِكُمْ مِنْ شَيْءٍ))روم /٤٠ واتە (( خوا ئەو زاتەیە كەدروستی كردوون پاشان ڕزق و ڕۆزی پێبەخشیون ، لە دواییدا دەتانمرێنێت ، پاشان زیندووتان دەكاتە,وە ئایا هیچ كام لەوانەی كردوتانن بە هاوبەشی خوا شتی وایان لەدەست دێ ).

فيا عجبا كيف يعصى الاله ام كيف يجحده جاحد
وفــي كـل شــيء لــه اية تدل على انه الواحد

واتە :زۆر سەیرە چۆن سەرپێچی لە پەروەردگار دەکرێ ،یان چۆن بێ باوەڕ ڕەتی دەکاتەوە ،هەمووشتێك بۆ پەروەردگار بەڵگەیەو نیشانەیە لەسەر تەنهایی ئەو.

بابیهێنینەوە یادی خۆمان لەسەرەتادا تۆمێك بوو پاشا دوو چاوو دوو گوێ و زارو دەمارو ڕەگ و ماسولکە و سوڕی خوێن ومۆخ و جگەر و سپڵ و دڵ و بیستن و قسەکردن وتوانای بزاوتن و بیرکردنەوەی لێ پەیدا بوو، کێ فەرمانی دا بە چاو کە ببینێت، وە بەگوێ کە ببیستێت ، وە کێ وتی بەدڵت هەست بکات ، وە کێ فەرمانی دا بە عەقڵت بیر بکاتەوە؟,,,

ئیتر چۆن واز لە چاوەکانت دێنیت – کە خوای گەورە بینایی تێ خستووە – تەماشای حەرامی پێ بکەیت ! ئایا شەرم ناکەیت لەبەردەم خوادا بوەستیت و پێت بفەرموێ : ئایا من بیستن و بینینم پێ نەبەخشیت .. دەنگی حەرام دەچێ بەگوێکانتاو تۆ دەیسەنیتەوە بۆی , ئەو کوڕو کچە لاوانەی لە ڕێگای پێگەکانی ئەنتەرنێتەوە و لە ڕێگای کەناڵە ئاسمانیەکانەوە تەماشای دیمەنە ڕووتەکان دەکەن .. سوێنتان ئەدەم بەخوا کێ ئەو چاوەی پێ بەخشین .. ئەو کوڕو کچە لاوانەی لە ڕێگای تەلەفۆن و مۆبایلەوە قسە لەگەڵ یەکتردا دەکەن ، ووشەی وا بەکاردێنن کە ئارەق بە تەوێڵدا دێنێتە خوارەوە و خوای پەورورەردگار توڕە دەکات ، سوینتان دەدەم بەخوا کێ توانای پێ بەخشیون کە بەزارو

زمان بدوێن ، وە ئەو کچەی گوێرایەڵی خواناکات وسەرپێچی دایك و باوکی دەکات بە شەوو بە ڕۆژ ، کێ ئەو سۆزەی بە دڵت بەخشیوە کە وات لێبکات شتت خۆش بوێت, ئەو دڵە مرۆڤی خۆش بوێت بەڵام دروستکەری مرۆڤی خۆش نەوێت .. ئەوە ئەو دڵەتە کەخوا پێی بەخشیویت و توانای سۆزاریی هەیە و عاشق دەبێت بە کەسێکەوە کە دروست نیە بۆی و خوای پەورەردگار لە بیر دەکات ، وە ئەو مێشکەت کە خوای گەورە پێی بەخشیویت بۆ بیر کردنەوە ، کاتێ دەست دەکات بە بیرکردنەوە یەکەمین بڕیار کە دەیدا داوا لە پەروەردگاری دەکات کە قەناعەتی پێ بکات بە فەرمانەکانی !...

ئایا بینیتان دوای ئەوەی کە دروستکراین چۆن دوور کەوتینەوە لە پەروەردگارمان ، وە ئێمە ئەسڵمان تۆمێکی لاواز بوو ، تۆمێك ئەگەر بەر کەمێك هەوا بکەوێت ئەوە تیا ئەچێت و دەمرێت ، ئایا وا نیە ! وەئەو تۆمە پارێزراوە تا دەبیت بە مرۆڤێك وەکو تۆ (فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ )) المؤمنون /١٤واتە ( بەڕاستی خوای مەزن بەرزو پیرۆز و موبارەکە ، وە چاکترین بەدیهێنەرو (( دروستکارە )) ).. دوای ئەوەی مرۆڤ دروستکرا ، باڕابمێنین لە چەند شتێکی تر ، باڕابمێنین لە سوڕی خوێن و چۆن هەناسە دەدەیت و چۆن خۆراك هەرس دەکەیت وچۆن بیر دەکەیتەوەو چۆن دەبینیت ..وە ئێستا دەست دەکەین بە گەڕانێکی زۆر خێرا هەواڵی چەن شتانێکت پێ دەدەم کە لەوانەیە نەیانزانیت ؟ بەڵام بۆ ئەوەی تواناو دەسەڵاتی پەروەردگات بۆ دەرکەوێ ، لێرەدا وا چەن نمونەیەکی زۆر سادە دێنمە.

ئایا دەزانیت ئەگەر خانەکانی لە شت نوێ نەبنەوە بە بەردەوامی‌یەوە زۆر زوو پیر دەبیت و چالاکیت نامێنێت وتوشی بێ توانایی دەبیت و هەر لەگەڵ لەدایك بونتدا بەخێرایی دەمریت ، وە بۆ ئەوەی بە چالاکی و لەش ساغیەوە بژین پێویستە خانەکان نوێ ببنەوە ... لە لەشی مرۆڤدا و لەیەك خولەكدا دوو سەد ملیۆن خانە دەمرێت، وە دووسەد ملیۆن خانەی نوێ جێگایان دەگرێتەوە بۆ ئەوەی بە لاوێتی بمێنیتەوە یان بە زیندوێتی بمێنیتەوە ، ئەی لاو.. ئەی ئەوەی بەهێز و بازوی خۆتا دەنازیت ، وئەو هێرشەش لە ئەنجامی ئەو دووسەد ملیۆن خانەیەدایە کەبەبەردەوامی نوێ دەبنەوە .. تا ئەوڕادەیەی خانەکانی ڕوخساریش ..تا ڕوخسارت بەجوانی و شۆخ و زیندوێتی بمێنێتەوە ، خانەکانی ڕوخسارت هەموو چوار سەعات جارێك نوێ دەبنەوە,, کێ‌ئەم خانانەی فێرکرد کەبگۆڕێن وە خانەکانی چێژ بەزمان ، وە بۆ ئەوەی بتوانیت تام چێژ بکەیت بە بەردەوامی هەموو حەوت ڕۆژ جارێك خانەکانی نوێ دەبنەوە ، وە پەردەی ناوەوەی گەدەش تاوەکو بتوانێ هەرس بکات ماوە بەماوە ئەم پەردەیە نوێ دەبێتەوە .. بیهێنە خەیاڵی خۆت ئاخۆ چیت بەسەردا بێت بەبێ پەروەردگار ، وە ئایا بیر لەوە دەکەنەوە کە بەبێ چاودێری و ڕەحمەتی پەروەردگار ژیانمان بەرەوە چ ئاقارێك دەڕوات و ناڕەحەت دەبین .. براو خوشکانم ئایا خەیاڵی ئەوە دەکەن کە بەبێ پەروەردگار ژیانمان ناڕەحەت دەبێ و ئەبێ بەهای مرۆڤ چی بێت بەبێ ڕەحمەت و بەزەیی پەروەردگار . ئەو تەنها پارچە گۆشتەی کە دەیخۆین بەبێ ئەو هۆکارانەی کەخوا پێ ی بەخشیوین بۆ

هەرس کردنی, پێویستی بە پەنجا سالْ دەبێت تا هەرس دەبێت ئەگەر بچێتە گەدەوە و بەبیْ ئەو ئەنزیم و هەوێنانە ، ئەو پارچە گۆشتەی دەچێتە گەدەوەو بۆ ئەوەی شی بێتەوە پەنجا سلْ دەمێنێتەوە ، بیهێنە خەیالْی خۆت هەموو ڕۆژیْ چەند پارچە گۆشت دەخۆیت .. بەبیْ ئەوەی هیچی لەگەڵدا بخۆیت .. وە ئادەمیزاد لەوانەیە پێش خواردنیش ناوی پەروەردگار نەبات و یادی نەکات , وە سوپاسی ئەو خوایە ناکات کە تێری دەکات و تینوێتی دەشکێنیْ .. ئەو زیکرانە نالْێت ، لەگەلْ ئەوەشدا پاروەکەمان ناگرێت بۆ ئەوەی هەرس نەبێت ، چونکە گوێڕایەڵی پەروەردگارە ،ئەوە مرۆڤە بەندایەتی ڕەت دەکاتەوە ,دەنا ڕۆزی و نیعمەت بەندایەتی ڕەت ناکەنەوە .

وە ئەگەر پارچە گۆشتت خستە ناو دەمت ، تەماشای ئەو پێکهاتە سەیرە بکە ، یەکەمین شت ددانەکانە، ئایا تێبینی ئەوەت کردووە کە ئەو ددانانە تاکە ئێسکن کە ڕووپۆش نەکرابن ، بۆچی ؟ چونکە ئەرك و کارێکیان هەیە کە ئەویش جوینە ، وە بۆ ئەوەی بتوانیت شت بجویت دەبێت پووك ماسولکەی زۆر بەهێزی تێدا بێت ، وە دوای جوین زمان لە ڕیْ ی گلاندەکانی دەمەوە مادەیەك دەردەکات کە یارمەتی هەرس کردن دەدات .. وە دوای ئەوە زمان بۆچی لیك دەردەکات ؟ تا پارێزگاری گۆشتەکە بکات و پاشان بڕواتە قوڕگەوە ، وە کاتیْ دەڕواتە قورگەوە زمانە چکۆڵە یەتە دەروە ، زمانە چکۆڵە ئەو شتەیە کە ڕێگاو ئاراستەی خواردن یان خواردنەکە دیاری دەکات بڕواتە بۆر هەواوە کە دەبێتە هۆی خنکان یان بڕواتە سورێنچکەوە .. بیهێنە خەیالْی خۆت کە

زمانـە چـكۆڵەش زۆر سـەیر بەندایـەتی خـوا دەكـات ، هـەر كـە زمـان هەڵدەسـتێ بـە فـڕێ دانـی پاروەكـە بـۆ نـاوەوە ، زمانـە چـكۆڵە بـۆری هەناسـەدان دادەخـات . كـی فێـری ئەمـەی كـرد ؟! وە هەنـدێ جـار زمانـە چكۆڵە هەڵە دەكات ، تاخوای پەروەردگار بەهای زمانە چكۆڵە بێنێتـەوە یاد ، بۆ ئەوەی كاتی دەخۆیتەوە بڵێیت : سوپاس بۆ خوا – الحمد لله – تا لاوازی خۆت بزانیت ، تا بزانیت ئەم كارە بەدەست تۆ نیە ، ئیتر چۆن دوای ئەمـە سەرپێـچی دەكـەیت ؟ خـوای گـەورە بەتوانایـە كـە ئـەو زمانـە چكۆڵەیە بكاتـەوەو بەیـەك سات بمریت ، ئەی ئادەمیزادی لاواز مردنت تـەنها ساتێك ناخایـەنێت ، سـاتێك كـە گونـاه دەكـەیت ، بـەڵام ڕەحمـەتی خوایە تۆ شەوو ڕۆژ سەرپێچی دەكەیت و تەنها جارێكیش زمانـە چكۆڵە بەڕووی بۆری هەوادا نەكراوەتەوە ، چونكە بەندەی خوایـە ، وە لەوانەیـە لە هەموو تاوانێكدا خۆی بێ بەری كات لە تۆ ، وە بڵێ: پەروەردگارا ڕێم بدە بـا بەهیلاكیـدا بێـنم. وە ڕۆژی قیامـەت دادێ و لـە شـایەتیەكانیدا دەڵـێ : پـەروەردگار بـە درێـژایی ژیـان ڕۆزیـت پێـدا بەهـەزاران ڕۆژی و پاروو كە ئەم هێشت هیچی لێ بی .ئەمە بەرفەمانی تۆ بوو پەروەردگارم براو خوشكانم تەماشای بێ دەسەلاتی خۆتـان بكـەن ، تەماشـاكەن ئێمـە سەرپێـچی لـە كـێ دەكـەین ، تەماشـای قـەبارەو شـێوەمان كـەن و ڕادەی پێویـستی بوونمـان بـە پەروەردگار .. كـاتێ پـاروو دەگاتـە زمانـە چكۆلە فەرمان دەدات بە داخستنی بۆری هەواو كردنـەوەی سورێنـچك . پاشـان پاروەكـە دەچێتە سورێنـچكەوە ، سورێـنچك هەڵدەسـتێ بـە ڕژاندنـی ئـەو ئەنزیمانـەی هەڵدەسـتن بـە كـەمێك هـەرس كردنـی خواردنەكـە ، دەسـت

دەكات بە جوڵە لە شێوەی كرمدا تاوەكو تیكەكە دابەزێت و بچێتە گەدەوە ، وە كاتێك دەگاتە گەدە گەدەش دەست دەكات بە ڕژاندنی ئەنزیمەكانی هەرس كردن .. كێ هەموو ئەمان دەكات ! كێ هەموو ئەمانە ڕایی دەكات ؟ كێ دروستكەرە ؟ ,, وە ئەو ئەنزیمانە گۆشت هەرس دەكەن و تایبەتن بە هەرسكردنی گۆشتەوە

لێردا پرسیارێك هەیە .. گەدە لە چی پێك دێت ؟ .. لە گۆشت ! ئەی چۆن ئەو ئەنزیمانە گۆش هەرس دەكەن و گۆشتی گەدە هەرس ناكەن .. چونكە پەروەردگار ڕووپۆشی گەدەی كردووە بەبەرگێكی لینج ڕێ لەو ئەنزیمانە دەگرێ كە هەرسی گەدە بكەن .. ئێستە تەماشای لاوازی خۆت بكە .. ڕابمێنە كاتێ پلە گۆشتێك دەخۆیت و دان بەوەدا دەنێیت كە هیچ بەهایەكت نیە بەبێ پەروەردگار ، تا ئەو ڕادەیەی ناتوانیت هەرسی پارویی بچوكیش بكەیت .

هارونە ڕەشید ئامۆژگاریكەرێكی هەبوو ناوی (ابن السماك )بو ، هارونە ڕەشید (( ئەو كەسایەتیەی كە مێژوو زوڵمی لێ كرد و بە ئارەزو باز و عاشقی ئافرەتان و كەنیزەك و ... و...و... وەسفی دەكات .. ئەم پیاوە زوڵمی لێكرا... ساڵێك حەجی دەكرد و ساڵێكیش جیهادی دەكرد .. بەڵام زوڵمی لێكرا بۆ ئەوی مێژوومان بشێوێنن .. لاوان دەڵێن : ئێمە مێژووی ئیسلاممان ناوێ.. ئەم پیاوە هەموو شەوێ سەد ڕكات نوێژی دەكرد .. بیهێننە خەیاڵتان هیچ كەس ئەو كارە ناكات)) ڕۆژێكیان هارون بە ئامۆژگاریكەرەكەی ووت : ئەی ابن السماك ئامۆژگاریم بكە ..

ئـەویش ووتـــی : ئـــەی ئـــەمیری ئیمانـــداران ئەگـــەر ئـــاوی خواردنـــەوەت لیٰ قەدەغـــە بکریٰـــت ، چـــەنیٰك لـــە ســـەروەرت و ســـامانت دەبەخشیت تا دەستت کەویٰت؟

هارونـــە رەشـــیدیش بـــیری کـــردەوەو ووتـــی : نیـــوەی سامانەکەمدەبەخـشم بـۆ ئـەوەی ئـاو بخۆمـەوە ..وە پیٰـی ووت : ئـەی ئـەمیری ئیمانـداران ئەگـەر ئاوەکـەت خـواردەوەو لـە قورگتـدا گیر بوو نـە ئەهاتە دەر ، چەنیٰکی سەروەت و سامانت دەیا بۆ ئەوەی رەزگات بیٰت؟

ووتی : نیوەکەی تری سەروەت و سامانم ئەیا .

ابن السماك ووتـی : ئـەی ئـەمیری ئیمانـداران ئەگـەر سـەروەت و سـامانیٰك یەکـسان نـەبیٰت بـە ئـاو خواردنەوەیـەك بـۆ پادشـایەك ئـەوە یەکسان نیە بە هیچ ، ئەو سەروەت و سامانە چیە ؟.

حەســـەنی بەصـــری دەلـــیٰ :( نـــەوەی ئـــادەم هـــەژارە ئەجـــەلی دیـــاریکراوە ، ئومیٰـــدەکانی دا پۆشـــراوە ، میٰـــشوولە ئـــازاری دەیـــاو نزگەرەش دەیکوژیٰت چۆن دوای ئەوەی ئەم ووشانە دەخویٰنیتـەوە تـاوان دەکەیت ، چۆن دەتوانیت دوای هەموو ئەمانە قسەی ناشیرین و نابـەجی بـەدەمتا بیٰـت؟ چـۆن پـشت بـە نیعمـەتی خـوا دەبەسـتیت بـۆ ئـەوەی سەرپیٰچی خـوا بکـەیت ! ئـەو رۆزیـت پـیٰ دەبەخشیٰ و تۆش لـە خراپـەدا بـەکاری دەیٰنیـت ، چـۆن رۆژی دوایـی روو بـە رووی دەبیتـەوە ، چـۆن لـە قیامەتدا لە بەردەمیدا دەوەستیت ، چیپیٰ دەلٰییت ، چۆن ئـەو تـا ئیٰستا تۆی پاراستوو. سبحان الله تعلی ! تەماشـای شتیٰکی تـری سـەیر بکـە ، دوای ئـەوەی خـواردن هـەرس دەبیٰـت رەگـەکانی خـویٰن دەسـت دەکـەن بە

خواردن • ڕەگی بلاوە بوون بەسەر هەموو ئەندامەكانی لەشدا دەگەن بەهەموو ئەتۆمێكی سەر لەش وە شلەی ئەو خواردنە دەگات بەهەموو بەشەكانی لەش تاوەكو ئەندامێكی لەشت نەمێنیت كە سودمەند نەبووبێت ، كێ ئەو خۆراكە دەگەیەنێتە ئەو ڕەگانە ؟ پاشان تەماشای مێشك بكە بە شێوەیەك هەزار ملیۆن خانەی دەماری هەیە كەوەك وایەرێك پێكەوە لكاون وە ئەو وایەرانە پێك هاتوون لە شانەی دەماریی گەیەنراو بەهەموو بەشەكانی لەش ، وە ئەو شانانە پێك هاتوون لە ئامێری گەیاندن و وەرگرتن (( ارسال واستقبال )) زانیاری دەگرێت و دەیگەیەنێتە مێشك و مێشكیش وەلامی دەداتەوە ، بەو شێوەیە كرداری وەرگرتنی زانیاری و وەلام دانەوەی بە خێراییەك ئەنجام دەدرێ كە ناردن و وەرگرتن دەگاتە حەفتا میل لە سەعاتێكدا ، واتە بەشێك لە بەشێك لە بەشێكی چركەیەك لە ناو لەشتدا ، تا ئەو ڕادەیەی مێشك بەبێ ئەوەی هەست بكەیت وێنەی هەموو بەربەستەكان دەگرێت. زانایان دەڵێن : لە پێناوی بەڕێوەبرنی ئەو كارو بارانەی لەناو مێشكدا ڕوو دەدەن ئەویش بە بەكارهێنانی ئامێری كۆمپیوتەر ،ئەوە ئێمە پێویستیمان بە ڕووبەرێك هەیە بۆ دانانی ئەو ئامێرانە كە بە قەبارەی شاری نیویۆرك بێت.. بیهێنە خەیاڵت ئەو شوێنە بچوكە لە مێشكت ،چی لەناویدا روودەدات ! پاك وبێگەردی بۆ ئەو خوایەی كە لەو شوێنە بچوكەدا هەموو ئەو توانایەی كۆكردۆتەوە..

دوای ئەوە یەكێك یەت و دەڵێ : من قەناعەتم نیە خوا فەرمانی پێداوم بەو كارە !!.. تۆ كێیت ؟ قەبارەی تۆ چەنێكە خوای پەروەردگار

دەفەرموێ (( وفي انفسكُم افلا تُبصِرون )) الذاريات /٢١ واتە (( هەروەها لە خودی خۆشتاندا ( بەڵگەی بێ سنور هەیە لە سەر دەسەڵاتی خوا ) ئەوە بۆ بینایتان ناخەنەکار )) تۆ خۆت نابینیت ؟ ڕابمێنە لە خودی خۆت تا تواناو دەسەڵاتی پەروەردگارت بۆ دەرکەوێ

زانایان دەڵێن : –بۆ ئەوەی کە بتوانیت ببیستیت– لەگەوێدا دە هەزار خانەی بیستن هەیە ، دەهەزار خانە بۆ ئەوەی دەنگ بە ڕوونی و پاراوی بگات بە تۆ .

وەلە ناوچاودا سەدو سی ملیۆن خانەی وێنەگرتن هەیە بۆ ڕووناکی لەناو ئەو شوێنە بچوکەدا .

وە بۆ ئەوەی بتوانیت بڕۆیت بەڕێوە پێویستە هەماهەنگیەی وورد هەبێت لە نێوان دوو سەد ماسولکە – بۆ هەموو هەنگاوێك – وە بۆ ئەوەی دەستت بەرز بکەیتەوە و دایبنەوێنیت ئەوە پەنجا ماسولکە بە ڕێکەوتن لەگەڵ مێشکدا دەبزوێن .

وە بۆ ئەوەی بتوانیت بچێت بەڕێگادا دوو سەد ماسولکە دەبزێن ، چلیان دەجوڵێن بۆ ئەوەی بتوانیت قاچێکت بەرەو پێشەوە بەریت ، تۆ هەموو ئەم کارانە دەکەیت بەهۆی دەسەڵات و توانای پەوەردگارەوەیە .. لە فەزڵی پەروەردگارمانەوەیە ئەم زانیاریانە لەبەردەستماندایە تا توانا و دەسەڵاتی پەروەردگار بە چاوی خۆمان ببینین (( وفي انفسكم افلا تبصرون ))

بۆ ئەوەی بتوانیت قسە بکەیت تێکڕای لەرینەوەی پەتە دەنگەیەکان سەدو چل لەرینەوەیە لە چرکەیەکدا ..بۆئەوەی بتوانیت

قسه بکەیت ، زمان حەڤدە ماسولکە دەجولێنێت ، وە هەر دوو لێو بیست و چوار ماسولکە دەجولێنێ ، ئایا لەمانای ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار تێگەشتوویت ((فَوَرَبِّ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ)) الذاريات /٢٣ واتە (( سوێند بەپەروەردگاری ئاسمان و زەوی ، ئەو بەڵێنانە حەقیقەت و ڕاستەقینەیە ، هەروەك چۆن ئێوە قسەی ڕاست و دروست ئەکەن )) چی وای لە پەروەردگار کردووە سوێند بە دواندن و قسەکردن بخوات ، وەك ئەوەی کە قسە دەکەن ووتەکانی خوای گەورەش هەقن ، چونکە دواندن لە خودی خۆیدا موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانی پەروەردگار .. لە ڕاستیدا ئەگەر بمانەوێ هەموو ئەو موعجیزانە باس بکەین کە لەلەشی مرۆڤدا هەیە ئەوە پێویستیمان بە چەندین ساڵ هەیە و کۆتایشی نایەت!

خوای پەروەردگار دەفەرموێ((قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ)) الفرقان /٦ واتە (( تۆ ئەی محمد –ص– بڵێ : ئەو زاتەی ئەم قورئانەی دابەزاندوە بە هەموو نهێنیەك دەزانێت لە ئاسمانەکان و زەویدا )) کێ نهێنیەکانی ئاسانەکان و زەوی دەزانێت ؟ بێگومان خوای پەروەردگار .

پەروەردگار دەفەرموێ ((سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ))

فصلت /٥٣ واتە : ئێمە لە ئایندەدا بەڵگەو نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بونەوەرداو لە خودی خۆشیاندا تا بۆیان ڕوون بێتەوە کە ئەو زاتە هەق و ڕەوایە ))

پەروەردگار دەفەرموێ ((وَقُلْ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا... )) النمل : ٩٢ واتە (( بڵێ سوپاس و ستایش بۆ خوا ، لە ئایندەیەکی نزیکدا هەموو بەڵگەو نیشانەکانی خۆیتان نیشان دەدات و دەیانناسنەوە ...))

ئایا ناسیتان ، بەڵگەو نیشانەکانیتان نیشان دەدات ، وە پاشان بۆتان دەردەکەوێ کە ئەمانە خوا سازاندونی و دروستی کردوون ، کە هەموو شتێ بەباشترین شێوە دەسازێنێ. لەوانەیە ئەم قسانە لەڕوی روشەی ناسکەوە دەوڵەمەند نەبێ چونکە دەربڕینە زانیستەکان هەندێك جار کەمێك وشکن ، بەڵام ئامانجی ئەم وتانە ئەوەیە بیر لە لاوازی خۆت بکەیتەوە ، وە بیر بکەیتەوە کە تۆ چەند هەژار و لاوازیت .. وە دوای ئەوەی بیر دەکەیتەوە لێت دەپرسم ئەی ئەو کەسەی کە نوتفەیەك یان ، چەند خانەیەکی هەڵواسراو یان گۆشت پارەیەك بوویت ، ئەی لاوازی هەرە لاواز ، ئەی ئەو کەسەی بە بێ خوای پەروەردگار بەهاو نرخت نیە .. پێت دەڵیم : ئایا ئێستا لەمانای ئەم ووتەیەی پەروەردگار تێگەیشتی ((إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ)) البقرە/١٣١ واتە (( کاتێك پەورەردگارت پێی ووت : ملکەچ و فەمانبەرداربە ، ( ئەویش خێرا ) ووتی : تەسلیمی پەورەردگاری هەموو جیهان بووم ( باوەڕی پتەوم پێ ی هەیە )

کاتێ پەروەردگار فەرمووی بە ئیبراهیم : (( اسلم یا ابراهیم )) اسلم : بە واتای تەسلیمی فەرمانی من ببە ئەی ئیبراهیم ( اذ قال لە ربە اسلم ) ڕاستەوخۆ پێشەوامان ئیبراهیم وەڵامی دایەوە (( .. أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ )) ئەم ووتانە مانای ئەوە نیە تۆ گوناهو سەرپێچی نەکەیت بەڵکو

مانای ئەوەیە تۆ تێبکۆشیت دژی سەرپێچی کردن چونکە دەستەڵاتی پەروەردگارت بۆ ئاشکاربوو . ئەوانەی ئەم ووتانە دەخوێننەوەو هێشتا بەردەوام بێ ئاگان لە پەروەردگار ..ئایا ئەم ووتانە پەروەردگاریان دێنێتەوە یاد .. ئەوانەی ژیان بەسەر دەبەن بۆ ئەوەی بخۆن و بخۆنەوە و زەواج بکەن و ئەوەیان ببێت و بمرن .. ئەوەی بژی بۆ ئەوەی تەنها بخوات, ئایا جیاوازی نێوان ئەو و نێوان زۆرێك لە گیاندارەکانیتر چیەیە کە لەوانیە لە ویش زیاتر بخوات ؟! وە ئەوەی ئەژی بۆ ئەوەی ئەوە بخاتەوە جیاوازی لە نێوانی ئەم و کەروێشکدا چی یە ، بەلانی کەمەوە ئەو لەتۆ ئەوە زیاتر دەخاتەوە .. بۆچی ئەژیت ! ئێمە لەم جیهانەدا دروست کراوین تا خوا بناسین و خۆشمان بوێت .. بەهەموو ئەم نازونیعمەتەوە بەهەموو ئەم دەسەڵاتەوە کەچی تا ئێستا خوا ناناسیت .

پەروەردگار دەفەرموێ ((وَعِنْدَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِنْ وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ(٥٩)وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُمْ بِاللَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُمْ بِالنَّهَارِ..)) الانعام )) /٥٩ وات (( کلیلی هەموو شاراوەکان و زانینی هەموو نهێنیەکان بەدەست خوایە و هەر لای ئەوە ، کەس نایزانێت جگە لەو زاتە ، هەرچی لەسەر ووشکاذییە خوا پێی دەزانێت ، هەروەها هەرچی لە دەریاکانیشدا هەیە ئاگای لێیەتی و هیچ گەڵایەك ناکەوێتە خوارەوە خوا پێ ی نەزانێت ، هەروەها دەنکێك یان تۆوێك لە تاریکاییەکانی زەویدا نیە ئەو دەنکە چ شێدار بێت یان ووشك بێت ، هیچ نیە لەخوا پەنهان بێت و لە ( لوح المحفوظ ) دا تۆمار نەکرابێت (٥٩ ) هەر ئەو زاتە

بەشەو خەوتان لێ دەخاو دەزانێت لە ڕۆژدا چ کارو کردەوەیەك ئەنجام دەدەن )) (( وهــو القَــاهِرُ فَــوقَ عِبَــادِهِ )) الانعـام /٦٦ واتـه (( ئـەو زاتـه دەسەلأتداری بێ سنورە بەسەر بەندەکانیدا ..) تواناو دەسەلأتی خوا بناسن ((وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّماوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ)) الزمر /٦٧ واتـه (( خوانەناسان قەدری خوایان وەك پێویست نەگرت ، بەمەرجێك هەر هەموو گۆی زەوی پڕ مشتێکی قودرەتی ئەو زاتەیە لە ڕۆژی قیامەتدا ، ئاسمانەکانیش بەدەستی قودرەتی ڕاست و دروستی خوا پێچراون ، پاك و بێگەری بۆ ئەو پەروەردگارە مەزنەی شایستەی ئەوە نیە نەفامان هاوەڵی بۆ بڕیار بدەن)) .

با بێینە سەر سەیر ترین شت لە ناختا ، سەیرتر لە هەموو ئەو شتانەی کە باسکرا : گیانە (( الروح )) چۆن گیان کرا بە بەرتا ، هەست بە چی ئەکەیت و هەستت چۆنە بەرامبەری ، بۆچی کاریگەریت بە قەرئان ، ماهیەتی گیان چیەیە )) ((وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً)) الاسراء /٨٥ ... واتە : پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆح ( کەچیەو چۆنە ) بڵێ : ڕۆح بەشێکە لە فەرمانی پەروەردگارم بەدەست ئەوە ( من نازانم چیە و چۆنە ) وە هیچتان پێ نەبەخشراوە لە عیلم و زانست تەنها شتێکی کەم نەبێت )) پێغەمبەر – ص– دەفەرموێ (( ان احدكم يجمع خلقة فی بطن امه اربعين يوما نطفة ثم علقة مثل ذلك ثم يكون مضغة مثل ذلك ثم يرسل اليه الملك فينفخ فيه

الروح )) [١](( هەریەکێ لە ئێوە دروستکردنی لە سکی دایکیدا چل ڕۆژی پێ دەچێت ، نوتفەیەکە پاشان چەند خانەیەکی هەڵواسرا وەکو ئەوە پاشان دەبێت بە گۆشت پارە وەکو ئەوە پاشان فریشتەی بۆ دەنێردرێت و ڕۆح دەکات بە بەریدا )) ئێمە زۆر هەژارین ، یەکسان نین بە هیچ ئێمە هەموومان خاوەنی هیچ شت و کردەوەیە نین (( وَمَا أوتيتم مِنَ العِلمِ إلا قَليلا )) لەو پەڕی لاوازیدا ..

... پاشان فریشتە دەنێرێت بۆی و گیان دەکات بەبەریدا فەرمانی پێدەدات بەچوار ووشە بەدیاریکردنی ڕۆزیەکەی و کاتی مردنی و کردەوەکانی چاکەکارە یان خراپەکارە ، پاش ئەوە فریشتە یەت و گیانت لێ ئەسێنێتەوە . سبحان الله چەند لاوازیت . بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگار ، خۆت دەبینیت کە بەهاو نرخت نیە تۆ دروستکراوێکی بێ دەسەڵات و لاوازیت ، وە لە خۆت بایی مەبە بە دنیا (( ماغَرَّكَ بِرَبِكَ الكريم )) الانفطار /٦ واتە (( چی وای لێکردوویت کە وەکو پێویست قەدری پەروەردگارت نەزانیت ...)) ئاست و قەبارەی خۆت بناسە و بگەڕێرەوە بۆ لای بەدیهێنەرەکەت ، پەیوەندی بکەرەوە بە پەروەردگارەوە ، شەو ڕۆژ لە خواپەرستیدابە .. سوجدە بەرەو بیپەرستە و فەزڵەکانی پەروەردگار بەسەرتەوە بناسە (( سُبحَانَ اللهِ وَ تَعَالى عَمَا يَشرِكُون )) القصص /٦٨ واتە (( پاکی و بێگەردی و بڵندی بۆ خوایە لە بەرامبەر ئەو شتانەوە نەفامان دەیکەنە شەریك و هاوەڵ))

---

[١] اخرجه البخاري (٣٢٠٨) ، ومسلم ( ٢٦٤٣) عن عبد الله بن مسعود –ر. ض)

پاشان ئەی ئادەمیزاد یادی ئەوە بکەرەوە کە تۆمێك بوویت و بیستن و بینیت بۆ سازێنراوە دەگەڕێیتەوە و لەبەردەم پەروەردگاردا ڕادەوەستیت

تۆ ئەمڕۆ زۆر لاوازیت یان ئەو ڕۆژەی لەبەردەم پەروەردگاتدا وەستاویت و ئەویش دەفەرموێ ( عبدی الم اخلقك الم اسويك بيدى الم ارزقك الم اعطك كذا الم انعم عليك بكذا )) واتە : ئەی بەندەکەم ئایا دروستم نەکردویت ئایا بەدەستی خۆم نەم سازاندیت ئایا ڕۆزیم نەدایت ئایا فلاَن شتم نەدایتیٚ ئایا فلاَن ڕۆزیم پیٚ نەبەخشیت،

من هەرکاتیٚ خەیالٚ دەکەمەوە کە وەستاوم لەبەردەم خوای پەوەردگاردا ، لاواز و هەژار و ڕووت نامەی کردەوەکانم بەدەستەوەیە و ئەو پرسیارم لیٚ دەکات و لە نێوانی من ئەودا وەرگێڕێك نیە : ئەی بەندەکەم چی وای لیٚ کردیت لە خۆبایی بیت لێم بێباك بیت بەدیدارم ، ئایا ئاسان بوو بەلاتەوە ، ئایا نەت دەزانی کە ڕۆژیٚ دیٚ دێیتەوە بەردەستم ، ئایا ڕۆژی لێپرسینەوە (( يوم الحساب )) ت لەبیر چوو، ئەی بەندەکەم بیٚ باك بوویت بەرامبەرم ، ئایا چاودێر نەبووم بەسەرچاوەکانتەوە ، ئایا چاودێرنەبووم بەسەر دەستەکانتەوە ئەی بەندەکەم بۆچی تەماشای حەرامت کرد .....) چی دەڵێیت ؟ بۆچی ماڵی حەرامت خوارد ئەی بەندەکەم ، بۆ جەستەت دەرخست .. بۆچی کاری حەرامت کرد ، بۆچی منت نەپەرست ، بۆچی سوجدەت بۆ نەبردم .. ئایا فەرمانم پیٚ نەدایت بە کردنی پێنج فەرزەی نوێژ ، بۆچی لەکاتی خۆیدا

ئەنجامت نەدان ؟؟ بۆچی بۆ نوێژی بەیانی هەڵنەستایت ، بۆچی منت نەپەرست .. چی دەڵێیت !

پێشەوامان عەلی کوڕی ئەبو طالب دەڵێ (( من گەلانێك دەناسم ئاوات دەخوازن کە فڕێ بدرێنە ئاگری دۆزەخەوەو لەبەردەم خوای پەروەردگاردا نەوەستن ))

کەسانێك هەن لە شەرمدا گۆشتی دەم و چاویان دەکەوێتە خوار .. کاتێ یەکێکیان لەبەردەم خوای پەروەردگاردا وەستاوە ، هەر کاتێ کتێبەکەی دەخوێنێتەوە و سەر پێچییەکی تێدایە پارچەیە لە گۆشتی ڕوخساری دەکەوێتە خوار ... بەڕاستی ئێمە لاواز و هەژارین ، کەسمان نیە بێجگە لە خوا .. ئاگاداربە دنیا تووشی لە خۆبایی بوونت نەکات و بەرەو لای خۆی نەتبات و هەموو ئومێدوئاواتێکت شوقەو سەیارەو بینینی فیلم و لەبەرکردنی مۆدێلات بێت.

بەختەوری لە بەهەشتایە ، بیهێنە خەیاڵت کەخوا دڵشاد دەبێت پێت و تۆش دڵشاد دەبیت بەو ، وە دەفەرموێ : ئەی بەندەکەم بڕۆرە بەهەشتەوە ... کامەیە ئەو دنیایە تا لە خشتەمان بەرێت ؟ کامەیە ئەو دنیایەی پێبکەنێ پێمان، وە لەگەڵ هەموو ئەوانەدا ناتوانین بەرەنگاری بینەوە ، با سی یان چل ساڵێك ئارام بگرین .. دوای سی یان چل پەنجا ساڵی تر کەسمان بەم سەر زەویەوە نامێنین و هەموومان دەبینەوە بە خاك .. دڵتان خۆش نەبێت بە دنیا هەموومان دەڕۆین و بەجێی دەهێڵین ، کامەیە ئەو دنیایەی ناتوانین بەرگری خراپەی تیادا بکەین هەموو ڕۆژێ ئەم پرسیارەم ئەڕاستە ئەکرێ : من دەستەوسانم لەبەردەم

سەرپێچیکردندا . مـن دەستەوسـانم لـە لەبـەرکردنی بالآپۆشـیدا, مـن دەستەوسانم لە چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکم .. ئـەی کـەی دەتوانیـت ؟ ئەگەر لە ئێستاوە تێنەکۆشین لەگەڵ خۆماندا کـەی دەتـوانین ئـەوە بکـەین ! ئەم دنیایە زۆر زۆر کورتە ، کاتێ ئەمە دەڵێم لە ناخی دڵـمەوە دەیڵـێم و لە خۆم دەترسم و لە ئێوەش .. لـە وە دەترسـم هەنـدی کـەس ئـەم ووتانـە بخوێنێتەوە و هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نەیەت .. بترسن لە خۆتان .

ئـەی لاوی کـچ ئەکـەی فریـو بـدرێیت بـە هاوڕێکانـت چـی دەکـەن ,یان لە کوێ شەوانە بەسەر دەبەن و قەسە کردن دەربارەی باوو مۆدێل و سەربەسـتی وگـەنج و شـەو بەسـەر بـردن .... و...بـالاوانی کـوڕو کـچ چۆنیان دەوێ دڵخۆش بن بەلآم ئاگاداری ئەم ئایەتـە بـن ((قُـلْ بِفَـضْلِ اللَّـهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُـوا هُـوَ خَيْـرٌ مِمَّـا يَجْمَعُـونَ)) یـونس/٥٨ واتـە : ئـەی محەمەد بە ئیمانداران بڵێ : با دڵشادو شادمان بـن بـە فـەزڵ و بەخشش و ڕەحمەتی خوایی ، با هەریەکە دڵخۆش بن، هەر ئـەوە چاکترە بۆیـان لـە هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی کۆی دەکەنەوە و کەڵەکەی دەکەن ))

ڕۆژێك دێت دڵخۆش ببیت لە پێناوی خوادا دڵخۆشیەکەت ملیۆن جار باشترە .

ووتەیەکی حەسـەنی بەصـری و مـالیکی کـوڕی دینـارت دێنمـەوە یـاد: ئـەی بەنـدەی گوناهکـار بگـەڕێرەوە بـۆلای پـەروەردگارت ، ئـەی بەندەی ڕاکردوو بەگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت ، ئەی بەنـدەی نەبـەکام بگەڕێرەوە بـۆ لای پـەروەردگارت ، پـەروەردگارت بەشـەو و بـەڕۆژ بانگـت دەکاو دەفەرموێ: بۆ کوێ دەچیت بێجگـە مـن پـەروەردگاری تـرت هەیـە ،

پێت دەفەرموێ : ئەوەی بستێ لێم نزیک بێتەوە باڵێک لێ ی نزیک دەبمەوە ، ئەوەی باڵێک لێم نزیک بێتەوە باسکێک لێ ی نزیک دەبمەوە ئەوەی بەرەو پرووم بێت بە پرۆیشتن من پرادەکەم بەرەو پرووی ، پەروەردگارت دڵخۆش دەبێت بە تۆبەکردنت ، پەروەردگارت بە شەو دەستی پرا دەخات تا گوناهبارانی پرۆژ تەوبە بکەن ، وە بەپرۆژ دەستی پرادەخات تاگوناهبارانی شەو تەوبە بکەن .. پەروەردگارت هەموو شەوێ بانگت دەکاو دەفەرموێ : ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر بەقەد پرووبەری زەوی تاوان بکەیت و پاشان بێیتە دیدەنیم و هاوەڵم بۆ بڕیار نەدەیت ئەوە بەقەد پرووبەری زەوی لێت خۆش دەبم ، پەروەردگار بانگت دەکات و دەفەرموێ : ئەگەر تاوانەکانت بەقەد پانتایی ئاسمان بێت و پاشان داوای لێخۆشبوونم لێ بکەیت لێت خۆش دەبم

**سبحان الله .. سبحان الله ... سبحان الله**

و/حسین محمود

٢٠٠٦/٢/٢٧